# چیرۆکی

# داری جەنگیان

مه شهور به داری پیره دار

دانراوی ماموستا نوشاد دینه وه ریی

به هه وڵ وتیکوشانی
. عه زیز موحه ممه د پور

(( ناشبه ندی ))

# * چیرۆکی داری جەنگیان *

## مەشهور بە «داری پیرەدار»

دانراوی مامۆستا «نۆشادی دینەوەری»

پێشەکی، دۆزینەوەی جێگاو، ناوەکان

نوسینەوە و خستنە سەر ڕێزمانی کوردیی و فەرهەنگۆکەی

« هەورامی » و « سۆرانی »

لە:

عزیز محمدپور

« داشبندی »

وە

پی‌ناسه‌ی ئه‌م کتیبه :

- چیروکی داری جه‌نگیان مه‌شهور به « داری پیره‌دار »
- دانه‌ر : مه‌لا نوشادی دینه‌وه‌ری
- لی‌تویژه‌ره‌وه : عه‌زیز موحه‌ممه‌دپور ـ داشبه‌ندی
- ناشر : محمدپور
- چاپی : یه‌کەم ۱۳۷۸
- تیراژ : ۳۰۰۰ نسخه
- چاپخانه‌ی : په‌یام
- حروفچینی : محمدپور
- نرخ : 4000

نشر محمدپور : تاران ـ صندوق پستی

شابک : ۹۶۴_۹۰۱۲۷_۲_۹ ISB: 964 _ 90127 _ 2 _ 9

# ناساندنی نوسەر لە چەند دیریکدا:
******************************

ماموستا عەزیز موحەممەدپور (داشبەندی) لە روژی ۱۹ مانگی رەشەمەی سالی ۱۳۱۹ کوچیدا ، لە دایک بووە. پاش خویندن و تەواوکردنی گشت زانستە ئایینیە کان ، لە کوردستانی ئیران و عیراق دا ، شایەتنامەی ئیجتیهاد و ، فتوا و تەدریسی هەمو زانستە عەقلی و ، نەقلی یە کانی باوی سەردەم ، پاشان شایەدنامەی زانستگاییش لە شاری تاران وەردەگری و ، دەس دەکا بەیانە گوتنەوە لە قونجانە ناوەندی و ، زانستگاکانی تاران ، بە تایبەت زانکوی زمان و ویژەی عارەبی و فارسی دا .

تا ئیستا پتر لە سی کتیب و نامیلکەی کوردیی ، فارسی و عارەبی نووسیوە و چەند پەرتوکیشی لە عارەبی وە وەرگیراوەتەوە سەر زمانی فارسی .

زور وتاری لە گەلیک لە بابەتەکانی میژویی ، زمانەوانی و تویژە رەوەییدا کە برکییان بلاو کراونەتەوە ، نوسیوە . ئەم کتیبانەشی چاپکراون : « فیقهی شافعی ، ئاداب و رسومی کوردان ، قواعید صەرف ( چاپی زانستگای ئازادی ئیسلامی تاران ) ، پاسخ بە مەقامی ئوستاد شیخ‌الاسلامی کوردستان ، یاسانامەی ئەوقاف و ... » .

ئەوانەشی لە ژیر چاپ دان : « شیخ ئەحمەدی موکریانی ، گەردەنبەندی مرواری ( لە زانستی کەلام دا ) ، مەقولات ( لە زانستی حیکمەت دا ) ، میژولکەی فەلسەفە لە ۱۰۰۰ سال بەر لە عیسا ( ع ) وە » . دیارە دیوانی هەلبەستیشی بە کوردی ، فارسی ، عەرەبی و ... هەیە و چاپ نە کراوە .

ناوی هەمو بەرهەم و کارەکانی ، بە دریژی لە جیگەی خویدا نوسراوە .

ناوبراو هەروەها لە شاری تاران دایە و ، خەریکی نوسین و لیکولینەوەیە و کاربەدەستی حوکومەتە .

## * فرازهایی از مطالب مندرج در مقدمه کتاب :

۱ـ چند سطری در مورد فولکوریک منظوم کردی .
۲ـ شرح حال مختصری از استاد نوشاد دینوری ( سراینده داستان داری جنگیان )
۳ـ مکان درخت کهنسال مذکور در داستان .
۴ـ بررسی وضعیت جغرافیایی دینور در قبل از اسلام تا دوران ساسانیان .
۵ـ معنی واژه دینور و تاریخ پیدایش آن .
۶ـ وضعیت سیاسی و اقتصادی و فرهنگی دینور از بدو ورود دین مبین اسلام در این منطقه تا قرن ۸ .
۷ـ بررسی همه جانبه دینوردر دوران حکومت امرای کرد ( حسن‌وی ) .
۸ـ دینور در دوران سلاطین صفوی .
۹ـ محدوده جغرافیایی مناطق کوهستانی ایران در دوران سلاجقه و شاه سلیمان ایوه
۱۰ـ زمان پیدایش کلمه کردستان .
۱۱ـ معنای واژه‌های کرد ، کرمانج و تاریخ پیدایش آنها .
۱۲ـ آثار باستانی و قلاع تاریخی دینور .
۱۳ـ نامداران بنام دینور از صدر اسلام تا اواخر قرن یازدهم .



قابل ذکر است که هدف از بازگو کردن این گونه مقولات متوجه کردن اذهان همگان به واقعیتی است که مونتسکیو (۱۶۸۹ ـ ۱۷۵۵ م) مؤلف فرانسوی کتاب « روح‌القوانین » نیز بدان اشاره دارد . اگر چه نمی‌توان با سنگ مزار گذشتگان و نوشته روی آنها ، افتخار و مباهاتی را نصیب خویش ساخت ، اما در عین حال ناآگاهی از تاریخ و سرگذشت گذشتگان و بی‌اطلاعی از اینکه (( که )) بودیم و چه نوابغی را داشته و مام میهن ما در دوران تاریخ حیات پرافتخار ملت این مرز و بوم ، چه افرادی را به جامعه بشریت تقدیم داشته و آنان چه خدمات ارزنده‌ای را انجام داده و دارای چه مقام و ارزشهای والای انسانی و خدایی بوده‌اند و اینکه حالا چه هستیم و چه باید کرد تا فرهنگ و تمدن درخشان پیشین خویش را

بازیابیم و از هجوم و نفوذ بی‌وقفه فرهنگ بیگانگان که چون خوره به جان و ریشه فرهنگ غنی و آریایی ما افتاده و آن را در معرض نابودی بیشتر قرار می‌دهد ، جلوگیری بعمل آوریم ، خود خیانتی است بس بزرگ و نابخشودنی نسبت به نسل حال و آینده ملت .

مختصر سخن اینکه باید به یاری حق ، تلاش همه جانبه‌ای را در مورد بازشناسی خویش شروع کنیم تا موقعیت پیشین خود را بازیافته ، در مقابل تهاجم فرهنگی دیگران قد علم کرده ، با زنده نمودن فرهنگ و آداب و رسوم و زبان ملی و اصیل ایرانی و تمدن چندین هزار ساله این قوم آری‌تبار که جهانیان به گذشته درخشان آنان معترف هستند و نیز از نو بازسازی کردن زبان و فرهنگ ملت کرد که جدای از آن نبوده و نیست ، بلکه حتی پایه‌گذار و نیز پاسدار واقعی آن ، همین قوم اصیل آریایی بوده و خواهد بود ، جایگاه اصلی خویش را به دنیا نیز بشناسانیم و در تمامی زمینه‌ها ، بخصوص زمینه‌های فرهنگی ، با پیروی از دستورات آسمانی قرآن کریم و اجرای کامل مواد ۸ ، ۱۲ و ۱۵ قانون اساسی جمهوری اسلامی ایران ، آن را توسعه بخشیم . به امید تحقق یافتن تمامی آرمانهای حمیده و خداپسندانه .

## پیرەسی ناوەروک:

# چەن،دێرێک دەربارەی بەیت و،باڵۆرەی کوردیوە

دەگڵ ئەوشدا، لە شەڕەکانی یەکەم و، دوهەمی جیهانیدا، وڵاتی ئێمە واتە هەمو ناوچە کوردنیشینەکانی، ئێران، تورکیا، سوریاو، شۆڕەوی توشی هەزاران کوشت و، بڕو، تالاًن و، بڕۆو، نەهاتی، هاتن، زۆر پیاوی گەورەمان کوژران و لەدار دران، سامانی نەتەوایەتیمان، لە دەست بڕان، نوسراوەو، پەڕتوکمان، سوتان و، لە ئاگر خران، وڵات لەت لەت و، کوتکوت کران ، زۆر مافی ڕەوا، بە ناڕوایی وەبن لێچ دران،گەلێک پیاو، ماقوڵ، یەخسیرو، بەندی کران. بەڵام یەکێک لە هەرە سامانە بەوەجەکانی مێژویی و، ئەدەبیی خۆیی، واتە فۆلکلۆرو، بەیت و،باوی نەتەوایەتی، بە هۆی هونەرمەندە بەهەست و خۆناسەکان و، گەل ویستەکانەوە، لە کەلێن و، قوژبنی گوندە چڕو، هەڵەموتەکانی، زێدەکەمانەوە، وەکو، کەلەپورێکی بە نرخ، پارێزران، بەیت بێژە چاڵان و، لێهاتوکان، بۆ هەر، ڕوداوەیەك، بەیتیکیان داناوو، بە سەرهات و،کارە ساتە نالە بارەکانیان دەختە ناو چوار چێوە ی بەیتەوە، پاشان دەمبەدەم دەکەوتە سەرزاران و، لە کوڕی دیوەخان و،

کۆمەڵگـای پیرو، زۆرهـانو، لاوانـدا، دەخـوێنرایـەوە، هـەرقۆڵە مـیرو، بـە گ لەرێک، خۆشخۆینو، بەیت بێژێکی تایەبەتیٚ را،دە گرت، بـۆ ئـەوەی شـەوانـە لە کـاتی خەوتنـا، بۆخۆیو، میوانەکانی،یان، لە دەمی ڕاوشکارا، لە گەرمەی تەماڵ هەڵکێشانا. بەلاوژۆکی ئازیزەو، پاییزە، کەژو، کۆ. وەجوش بێنیٚو، هەستی ڕاوچی بزوێنیٚ، بە گوژە لە تەمـاڵ ڕاکێشیو کەروێشک لەلان دەربەڕێنی، کار مامزان، لە باسكو، باسکۆلان ڕاپەڕینیٚ، یا لە مەیدانو، گۆڕەپانی شەڕا، لە گەرمەی شالاٌوو، هێرش بردنا، لە وەختی لە نـاو، مـەتەرێزو سەنگەر جێی گرتنا، کوژو، کـاڵ هـەڵنیٚو، هەستێـان هـاندا. بـە تـوپو، تـەشەرو، فـڕ هاویشتن، دوژمنو، نەیار، لەبەر چاو، سوكو، چروكو، تـرسەنوك نیشـاندا، کـوژراوانـی خۆیی بە قارەمانو، بۆیرو، ئازا، بداتە قەڵەمو، پێیان هەڵبڵیو، ناوو، نیشانیان. بو هەڵداو، بیان لاوێـنێتەوە. شـینو، شـەپۆری هـاوالاٌن بگـێریٚو، تـانەو، تـانوتو، تـوانـج بـاوێتە، ڕاکردوانو، بیانگێرێتەوە. خوێڕیان بە دزێوو، سەرشۆر ناوبەریٚ.

هەر بەو هۆیەوە، بەیت بێژو، خۆشخۆین. لە دەستو، پێوەندی تر. بەڕێزو، ماقوڵتر بونو، لە گەل میرزاو، نوسەری تایەبەتێدا، لە دیوەخان، دا، دەنیشت، بە لای میرو، سەرۆک هۆزەکانەوە، شێوو، فەڕاوینو، فەڕاوتیو، بەرقەلیانیان دەخوارد. وەکو، کۆری ماڵیٚ،دا، دەندران. هاتوو، چۆیان بۆ ئەندەرونو، ناو ماڵو خێزان، بیٚ بەرگری بوو، دەیـان تـوانـی بەیتو ئـاهەنگو، نـەرێتیو، سـەر بـە هورتیـان بـۆ بگـێرنەوە، سـەرە ڕای ئـەوانـە، زۆر خۆشخۆینو، شەیاری دەنگ خۆشو، خۆشەویستی ناو،کۆمەڵیش هە بون، شە وانەو، پاش نۆێژی خەوتنان، بە تایەبەت لە شەوگاری دورو، درێژی پـایزدا، دوای هـەواسـاردبونو، زوقمو سیخوار کەوتنو، کۆ، کردنەوەی بەرو، بوی داهات، لێدانی تایەو قۆریو، گالێشی گیاو، وێنجە، کێشانی کاو، گزرەو،کۆدە. داخستنی زمهەڕرو تفاقی ئاژاڵ، لەناو مزگەوتو، مالاٌندا، خەڵکیان لە خۆ، کـۆوە دەکـردو، بـە گـۆرانـیو، لاوژۆکو، سیـاچەمانە. هـۆرەو، حەیرانو، لاوکۆ، کۆڕیان دەڕازاندەوەو، کوڵو، کـۆی خـەفەتو، پـەژارەی شـەکـەتیو، ماندوبونی هاوینیان لە بیر دەبردنەوەو، سەرخۆشیان دەکردن، زۆر، بلوێر ئـەنگێوی، وەك قالە مەڕەی «قادرئا»واو «نیسکاوا»ی لای «عیساکەند» توزە لە ژەنـی وەکـو، حـەسەن توزەلەی «مەلاٌلەر»و، نایەلێدەری وەکی کانەبی ئەمڕۆی «کامەم» هەبون، کە بە ئاهەنگە

رەسەنەکانی کوردی، ئەوبەیتو، باڵۆرەو، بە سەرهاتەیان. بە هەواو، دەنگی شمشاڵو، توزەلەو نایە، لە بەر بەیت بێژ، دەگێڕایەوەو، دو پاتەدەکردەوە. دیارە شایەریو، بەیت وێژی، هەروەك تایەبەتی پیاو، نەبۆوەو، زۆر ژنو، عافرەتی واش، هەبونو، هەن، لەم هونەرەدا، لە پیاو، نەماونەتەوە، تایەبەتی ناوچێکی کوردستانیش نەبۆەو، نیەو، بەڵکو لە هەمو، کوتە بەش بەشو، پس پسکراوەکانی ئەم هەریمە بەربلاٌوو، دورو، درێژەدا، بە دەیان کەسمان هەبونو،هەن، بە پێچەوانەی ئەم بیرو، باوەڕە، کە هێندێک لە نوسەرو، هۆنەرە برزەکانمان لایان وابۆوە. ماموٚستاکانی ئایینی لە دژی بەیتو، باوی خۆییو، ئاهەنگدا، وێستاونو، بەربەرەکانیان دەگەڵ کردونو، نەیان هیشتوە، گەشە بکەن، زۆر ماموٚستای رۆشنبیری وەک مەحمود ئەفەندی بایەزیدی[1] هەبون کە زۆر بەی چیرۆكو، ئادابو، نەرێتی خۆماڵی کۆکردۆتەوەو، لە کاتی خۆیدا، داوێە، بە سەر قونسولی[2] رۆسیای تەزاریو، ئێستاش هەرکەلکیان لێ وەرگیرێ، کەواتە، نەك، نەیان هێلاٌوە پەرە بستێنێ، بەڵکو خۆیان بە دڵ حەظیان لەم بابەتەکردۆەو، کارەساتو، بە سەر هاتە مێژوییەکانیشیان هۆنیوەتەوەو، سەخڵە تیوتووشیو، نەهاتی هۆزو، گەلیان،کردوٚتەبەیتو، بۆهەمیشە ناوی خۆیان لەم رێگەیەدا، خستۆتە، سەروی ناوی هەمو رێبوارانی رێگەی خزمەت بە گەلەوە چونکو بێ گومان، بەم کارەیان کەلێنێکی دیکەی فەرهەنگی فولکلۆریکی نەتەوەکەمانیان، پرکردۆتەوەو، ئەرکی سەرشانی خۆیان بە جێی هێناوە. ئەوانە بەلای هەمو گەل خۆشەویستو، دوستیارێکی کوردەوە جێگای رێزو، گەورەیین، بێ گومان یەکێك لەم هەستیارو، ماموٚستا بەئەمەگو،خۆاناسو، خۆناسە، زانایانە، ماموٚستا. نۆشادی دینەوەری یە ،کە چیرۆکی داری جەنگیان ، مەشهور بە «داری پیرەدار»ی. بە کەلك وەرگرتن، لە پاڵەوانو، شەڕەکانی ناو شانامەی فیردەوسی، هۆنیوەتەوە. کارەساتی سەردەمی نادرشای ئەفشارو، شاطۆماسبی صەفەویشی زۆر ماموٚستایانە تێدا، جێ کردۆتەوە، باری ژیانو، ئابووری، ڕامیاریو،تەنگو، چەڵەمەی ، خەڵکی ئەوکاتەشی بە باشی ڕاگەیاندۆە، کە من

---

١ بو ئاگاداری سەبارەت بە ماموٚستایی و، لیهاتویی، ماموٚستا بایەزیدی بڕوانە پێشەکیکەی ئێمە، لە سەر (ئادابو، ڕسومی کوردان) چاپی ١٣٧٠ کۆچی هەتاوی
٢ واتە: ئەلکسەندەر ژاپا.

**بەش بە حاڵی خۆوم سوپاسیان لێ دەکەم و، نزای لێ خوش بونیان لە بارەگای خاوەن شکۆی یەزدانی مەزن، بۆدەکەم. هەڵبەت ئەزی ژەبەنیش، بە پێی تواناو، هێزی زانستی مەلایانەی خۆم، وەک دەبینن، لە ساغ کردنەوەی وشەکانۆ دانانی فەرهەنگۆکەی گۆرانیو، سۆرانی، باشتر ناساندنو لە سەر رۆیشتنی ناوی پاڵەوانەکان، ناساندنی ماموستا نوشادو،ڵی تۆژینەوەی دینەوەر[1]، خستتە سەر شێوازی نوسینی ئەمڕۆی کوردی. هەوڵم، داوەو، کۆتاییم نەکردۆە، ئەگەر هەڵەو،کەم و،کوڕیتان تێدا، دی،کە بێ گومان زۆریشی تیا ئەبینن. بزانن هەر ئەوەندەم. هێزپێی شکاوە، بۆم راست کەنەوەو، بەرمنەتم کەن: هیوایە خوداوەندی میری مەزن، بۆم بە گوناح، نەنوسێو، ماموستاو چازانو، لاوەکانیش بە خشکە پلاری، توانج و، ژەخنەم تێ نەگرنو، چاو لەهەڵەم بنوقێننو، بە رون کردنەوەیان ژایەکی تر، پتر بەرمنەتم کەن:**

**تاران: عەزیز، موحەمەدپور، (داشبەندی)**
**رۆژی چوار شەمۆ، ٢٨ی پوشپەری ١٣٦٩ کۆچی هەتاوی:**
**١٣٦٩/٤/٢٨: ٢٨ ذیحەجەی ١٤١٠ هق: ٢١ جولای ١٩٩٠ زایەنی**
**کوردی ٢٦٠٢**

---

١ واتە: دینەوەر، لە گشت باریکەوە، کە «دە ـ ١٠» بابەت دەگرێتەوە. ١: باری هەڵکەوتنی دینەوەر ٢: واتای ووشەی دینەوەر ٣: دینەوەری سەردەمی ئیسلامەتی تا دەگاتە سەردەمی هێرشی تەیموری لەنگو، سوتاندنی ئەم شارە ٤: دینەوەری سەردەمی ئەمیرانی کوردی حەسەنوەی ٥: دینەوەری سەردەمی صەفەویکان ٦: ناوچە شاخاویکانی ئیران لە سەردەمی سەلجوقیو شاە سولەیمان، ئێوە،دا ٧: مێژوی پەیدا بوونیو وشەی «کوردستان» لە کتێبە مێژوییەکاندا. ٨: ووشەی کوردو کورمانج ٩: کۆشکو، قەلاکانی دینەوەر، لەبەر ئیسلامو، دوای ئیسلامدا.
١٠: ناودارو، پیاوە گەورەکانی دینەوەر، لە سەرەتای ئیسلامەوە تا چەرخی سێزدەهەم.

# بەرکولێک سەبارەت بە مامۆستا نۆشادو، دینەوەر

*«بە ناوی خودای تاک و تەنیا»*

هەروەك مامۆستای پایە بەرزو، تێکۆشەرو، شەکەتی نەناس، خوالێ خۆشبوی کورد، بابا مەردوخی کوردستانی لە، لاپەڕی ٣٣٠ی بەرگی یەکەمی تاریخی مەشاهیری کوردا، بە راگوێزراوی لە لاپەرەی ٨٤ی ژمێرەی پێنجی گۆڤاری دەنگی گیتی تازەوە رایگەیاندوە، دانەری هەڵبەستی (داری پیرەدار) مەلا نۆشادی گوڵباغی زەنگەنەیەو، هونەرێکی زۆر بە هەستو، خاوەن بیر بووەو، تا سەرەتای چەرخی سێزدەهەمیش ژیاوە، ئەمە راستە چونکو هەروەک خۆی لەم هەڵبەستەی‌دا کە دەڵێ «واتە لەزمان پیرەدارە کەوە ئەڵێ»

ئێستە،دەعوای‌دوخت، نادر،سوڵطانەن
عالەم جە، جورەش بێزار،جە، گیانەن
رعیّیەت فەرار، خەڵق خولقەش تەنگەن
اِقبالْ ئەولاد، شاه صەفی لەنگەن

دەری خستوە، ئەم چیروکەی لەسەردەمی نادرشاو، نەوەی شاەصەفی واتە شاطوماسب‌و، هو ملکیو، کەڵەوە کێشی نادرو، شاەدا، لە سەر، وەدەس خستنی طەلعەت خاتونی کچی سام بەگی زەعفەرانلوی سەرهۆزو، فەرمانڕەوای کوردی خەپوشان «قوچان»دا. هۆنیوەتەوە وەك ئیمەش لە باسی ئەم کەڵەوەکێشیدا رونمان کردۆتەوە. نادرقولی لە سالی ١١٠٠ هـ ـ ق دا هاتۆتە دنیاوە، لە سالی ١١٤٠دا

طەلعەت خاتون دەخوازیێ لە ۱۱۴۵دا لە دەشتی موٚغاندا دەبیّتە شـاە لە سـاڵی ۱۱۶۰دا دکوژریێ، ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی شەوە، ئەم نوسراوەی لە بەردەستی مندایە، لە بیستەمی مانگی رەمەضانی پیٖروزی ساڵی ۱۳۱۱ هـ.ق‌دا. نوسراوەتەوە [«تمت شد ۲۰ رمضان المبارک ۱۳۱۱ـ یونت ایل»] نوسەرەوە، بوٚئەوانەی مردون لە کاتی نوسینەوەی هەڵبەستەکانیان دا، (علیه‌الرحمه»ی بوٚار بردو، کردون بەڵاٚم بوٚماموٚستا نوشاد، ئەوخەلاٚتەی نەنـاردوٚە، دەر، دەکـەویێ لە کـاتی نـوسینەوەی هەڵبەستەکاندا، هیٚشتا زیندو بوٚوە، بە هەرچەشنیٚک بو بیٚ لە سەردەمی نادرشادابوە و ، ئەویش هەستی بەکوشت‌و، بٚری نادروٚ ماڵ ویٚرانی خەڵک کردوٚەو، وەک هەمو، هوٚنەریٚکی کوردی دڵسوٚزو، بە هەست. هیٚماو، ئاماژەی بوٚ ئەم کارەساتە کردوٚەو، لە زمانی داری پیرەوە، بە خەڵکی هاو چەرخی‌و، ئیٚمەی ئـەمرٚوی راگەیـاندوٚە. بەلاٚم. بابا مەردوخی لەوەدا، بە هەڵە چوٚوەکە فەرمویەتی یەکیٚک لە شوٚینەوارەکانی ماموٚستا نوٚشاد ئەم پارچە هەڵبەستەیە لە ژیٚـر، سـەر دیٚـرٚی (داری جـەنگەڵ) دا، چونکو، هەروەک ئیٚمە لە سەرەتای چیٚروٚکە،کەدا، نوسیومانە، [(داری جەنگیان) مەشهور بە داری پیرەدار ] کە ئیٚمەش لەبەر نوسراوەکەی ساڵی ۱۳۱۱ی کوٚچی مانگیٚوە، نوسیومانە تەوە، ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە، خودی ماموٚستا نوشاد لە کوٚتایی چیٚروکە،کەدا، لە زمان دارەکەوە دەڵیێ:

«بکەوتم، نە، روی خاك پەست ، زمین بـام
کس نــە بـــوو، تــوڵیێ، بـنیٚژوٚ، نـە، جـام
هـــالاٚ، کــە ئــاخر، وویــە ردوٚ، فــامەن،
چـــەن، ســاڵەن کـە «دار جەنگیـان» نـامەن

داری جەنگیان، واتە داری لیێ بە شەٚر هاتن، شەٚرگە، شـویٚنی بـەیەکـەوە جەنگان، چونکوٚ لە زمان‌و، ویٚژەی کوردیدا، پاشگرو، پیٚوەندی ئـەلف‌و، نـون، هەروەک چوٚن، بوٚ گەل‌و، کوٚمەڵ، دەکا،ر دەهیٚنریێ‌و دەگوتریێ پیاوان‌و ژنان واتە: ژنگەل و، پیـاوگەل، بـوٚ شـویٚن‌و، جیٚگـاش دەکـار، دەکـریێ، وەك، گـونبەذان، خەرمانان، یانی جیگەی گونبەذو، جیٚخون، کە واتـە، واتـای، داری جەنگیـان،

دەبێتە، دارێ، کە هەمو شەڕکەرەکانی ئێران هەر لە سیامەکەوە بگرە تا نادرقولی و، شاطوماسبی صەفەوی کوڕی شاسولطان حوسین لە بن ئەو دارە پیرەدا بوویەگشتیان لەوێ، جەنگاون و، تەمەن و، سالی نازتن و، چەقاندنی، داری کۆهەنسالی بۆ کەس رون نابێتەوە، کەس نازانێ بە دەس کێ لەو شوێنەدا، نراوە نەک داری جەنگەل، چونکو واتایەکی جوان و، وێژەوانانە ناداو، لە ناوچەی دینەوەریشا تا ئەو جێگایە مێژو، نیشانی داوین، بە تایەبەت لە سەردەمی ژیانی مامۆستا نۆشادا، جەنگەڵو، لێرەوار نەبوە، تا ئەوان بچنە ناو جەنگەڵو، دارێ، بە دی کەن و، وتووێژی دەگەڵ بکەن، سەرەرای ئەوەش دەورو، بەری ئەودارە، دەبێ پان و، بەرین و، روتەن بوبێ. چونکو جێگای بزوێن و، پردارو، دەون و، هەژگ، بۆشەڕگەو، جێگای لێ بە شەڕ هاتنی ئەوساکە، کە پتر شەڕ بە تیرو، کەمان و، سەرنێزە بوە، نابێ.

## هەوڵدان بێ ئاکام نابێ

ئاشکرایە هەر لەو ساوە کە من دەسم کرد بە نووسینەوەو لێکدانەوەی هەڵبەستەکانی ئەم چیرۆکەو، دیاری کردنی جێگاو شوێنی رووداوەکانی ناو چیرۆکوو هەڵدانی قارەمانەکانی ناوبراوی ناو چیرۆک هەر وەك لە هەوڵ دا بووم بۆ ئەوەی سەرەهەو دایەك سەبارەت بە باشتر ناساندنی مامۆستا نۆشاد لە نێو کتێب و پەراوە دسنوس و چاپکراوەکاندا وە دەس بێنم بەلام بە داخەوە تا ئێستا «٧٢/٨/٢٠ی کۆچی هەتاوی» لەم بارەوە تەنیا نووسراوەکەی مامۆستا «غەضەنفەری ئەمرایی خوڕەم ئابادی»م دەسکەوتوە کە ئەویش کەلکی لێ وەرگیراوەو، جێگای خۆشحاڵییە. زۆریش بە پەرۆشەوە لە هەوڵی ئەوەدا بووم لانیکەم جێگەو شوێنی ئەو پیرە دارەی مامۆستا نۆشاد بە «داری جەنگیان» ناوی بردوە، وە دەس خەم بەلام سەرم بە هەر کەلێن و کولێن و قوژبنێکی کتێب و نوسراوەکاندا، دەکرد، وەکوو ئەویندارێ بە دڵ خوازنەگەیشتوو، بە هەناسە ساردی بەرەو دوا، دەگەڕامەوە، تا ئەوەی خوداوڕاستان کە خەریکی کۆکرنەوەی

مەبەستێك سەبارەت بە دینەوەرو، پیاوە ناودارەکانی بۆ کۆنگرەی[1] «مەلا پەرێشان» بووم لە لاپەرەی ۲۹۰ی کتێبی (کرمانشاهان‌وکوردستان) بەرگی یەکەم نووسراوەی دوکتور مەسعوود گۆلزاری‌دا، چاوم بەم سەر دێرە کەوت «درخت چناری بسیار کهنسال در دهکدهٔ عبدالمحمد دینور» کە لە ژێرەوەدا بە راگوێزراوی لە بەرگی ۵ی کتێبی «فەرهەنگی جوغرافیای ئێران» لە لاپەرەیٚ ۲۹۶ەوە ئەم دەقە نووسراوە «عبدالمحمد، ئاواییکە لە ئاواییکانی دینەوەری سەر بە شاری صەحنەی کرماشان (کوزمانجان) کە کەوتۆتە سی‌ونۆ کیلۆمتری باکووری روژئاوای صەحنەو پازدە کیلۆمیتری روژئاوای شەقامی کرماشان بەرو شاری (سونقور)ەوە پاشان بەم جۆرە لەسەر باسی ئەم دارە پیرە دەرُواو دەڵێ: «لە ناوەندی گوندۆکەی عبدالمحمد، دا، دار چنارێکی زۆر پیرو لە مێژینە هەیە کە رەنگە بە تەمەن پیرترین و لە مێژترین داری ئەو ناوەندەبێ. بە هۆی ئەوەوە لە هەمو لایەکەوە کوڵەکەو دیرەگی وەبەر درابوو، وە لە زۆر شوێنەوە پشتێنەی لێ هاڵێن درابوو، نەم توانی بە باشی بە دەورەی بدەموو بارستایی‌و ئەستووری‌کەی ئەندازە بگرم. لام وایە تەمەنی ئەو دارە لە ۵۰۰ ساڵ زیاترە. ئەو دارە پیرە زۆر جێگەی رێزی خەڵکی ئاوایی عبدالمحمدو زیارەتگای خەڵکی ئاواییکانی دەورووبەروو ناوچەیە.» لە لاپەرەی ۸۱ یەکی پێشەکی کتێبی ناوبراو «کرمانشاهان و کوردستان»دا ئەم جۆرە هاتووە «هێشتا لە نێو زۆربەی هۆزە جۆر بە جۆرەکانی کورد دا هێندێک شوێنەواری ئایینی زەردەشتی دەتوانین بە باشی ببینین. وەك سوێند خواردن بە گڕی ئاگرو چراو، کوانوو، بەوودم‌و پیروز ئەژماردنی داری پیرو بە تەمەن: رێز دانانی زوَر بوَ مردوەکان، هەڵ ئاییساندن‌و داگیر ساندنی ئاگری بە مەشخەڵ لە سەر دوندو، بەرزایی چیاکان‌و هەر وە هاشتیکەی بەم جۆرە». جا بەم پێیە، من لە سەر ئەم بڕوایەم کە ئەو دارە پیرەیٚ ماموَستا نوَشادی گوڵباخی

---

۱ دیارە ئەم کونگرەیە لە روَژەکانی ۴و ۵ی مانگی سەرماوەزی ۷۲دا پێك هات، بەلاّم هەروەك چاوەڕوان دەکرا، هەر ناوی بێ ناوەروکێ‌بوو، کُردناسی بوو بەلاّم ووتەو، ووتاری کوردی باسی سەر بوو، بقە بوو کە ئێمەمانان بتوانین ووتارەکەمان بخوێنینەوە.

دینەوەری کردویەتە، شەڕگەی شەڕکەرانو، قارەمانانی ئێران هەر لە سیامەکەوە بگرە تا دەگاتە سەردەمی شەری نادرشایْ هەوشارو شاه صەفی کوری شاه سوڵطان حوسێنی صەفەوی، هەر ئەو دارە چنارە پیرەیْ ئاوایی عبدالمحمدی دینەوەرە: نادر قوڵی لە ساڵی هەزارو یەکصەد داهاتۆتە دنیاوە لە ۱۱۴۸هق دا بوتە شاه لە ۱۱۶۰ هق دا دەکوژریْ. شاه تەهماسب لە ساڵی ۱۱۰۶ داهاتۆتە دنیاوەو لە ساڵی ۱۱۴۴دا،کۆچی دوایی کردووە.

ئیستە دەعوای دوخت «نادر» «سوڵتانەن»
عالەم، جەجەورەش بێزار جەڕگیانەن
رەعیّیەت فەرار، خەڵق خوڵقەش تەنگەن
ئێقبال ئەولاد «شاه صەفی» لەنگەن

## دینەوەر، لە گشت بارێکەوە

لە بەر ئەوە کە مامۆستا «نوشاد» نووسەری ئەم چیرۆکە «داری پیرەدار» خەڵکی ئاوایی گوڵباغی ناوچەو، هەرێمی دینەوەر، بۆوەو، ئەم ناوچەیەش وەك زۆربەی ناوچەکانی دیکەی کوردەواری جێگەی پەروەرشتو، هەڵکەوتنی، گەلێک، لە چازانو، پیاوە هەڵکەوتۆوەکانی کوردە ناودارەکانی سەردەمی ئیسلامەتی بۆوە، بە پێویستم زانی، زۆر، لەوەی بۆ. رۆشنکردنەوەی چیرۆکەکە، پێویست بوو، دوا، بم، بە پێیێ تواناو، کەلك وەرگرتن لە گەلێک نوسراوەی دەسنووس،و، چاپکراوی کوردي،و، عەرەبی،و، فارسي، کە یەک یەك ناویان دەبردرێ،، لە،دە، بواردا، دینەوەر بخەمەبەر چاوی خوێنەرەوە بە ڕێزو، ئازیزەکانی ولاتەوە، بۆ ئەوەی بزانن تەنیا لەم ناوچەیەشدا، ئێمەی کوردەبە صەدان، زاناو، بلیمەتمان هەبۆوەو، لە هیچکام، لە ناوچەکانماندا، دایکی نیشتمان، هەرگیز، لە زگ نەوێستاوەتەوەو هەرگینراو، هەرگیزیش ناوەستیو، ناوێستیْ.

سەرنـــامەێی، نـــامە، نـــامێ اللّٰه
بـــێ نـــامی تـــە، نـــاتەمامەواللّٰه

*بەناوی خودای بەرزو بێوێنە*

دینەوەر، لەباری جوگرافیو بارودۆخی هەڵکەوتنی لە هەرێمی کرماشاندا. هەروەها دینەوەری بەر لە ئیسلامو دوای ئیسلامدا. دیارە ئەم باسە بە چەند پاژ،دا بەش دەکرێ

١ ـ باری هەڵکەوتنی دینەوەر ٢ ـ واتای ووشەی دینەوەر ٣ ـ دینەوەری سەردەمی ئیسلام تا دەگاتە سەردەمی هێرشی تەیمووری لەنگو سووتاندنی ئەم شارە ٤ ـ دینەوەری سەردەمی میرانی حەسەن وەی ٥ ـ دینەوەری سەردەمی صەفەوی ٦ ـ ناوچە شاخاوێکانی سەردەمی سەڵجووقیو شا،سولێمانێ ئێوە ٧ ـ پەیدابوونی ووشەی کوردستان لە کتێبە مێژووییەکاندا ٨ ـ کوردو کورمانج. ٩ ـ کۆشکو قەڵاکانی دینەوەر ١٠ ـ ناودار و پیاوە گەورەکانی دینەوەر. کە یەکەیەك سەبارەت بە هەموانیان دەدوێن، بۆ ئەوەی بۆ خوینەوەرە بە رێزو گۆیگرانی هێژاو ئازیزەکانی ئێرەو وڵاتەکانی دی،ئەم بابەتە روون کەینەوە، کە پێویستە بە تایەبەت لە هەلو مەرجی ئێستادا، خۆیانو وڵاتەکەیان باشتر بناسن، بزانن کێنو کێ بوون، چوونکو تا خۆت نە ناسیو، نەزانی کێی، خۆت بە لاوە سووكو چروکەو، بایەخ بە خۆتو هەستو بیرو ووڵاتو، نەرێتیو، سەرگوریشتەی بابو ،باپیرانت، نادەی، خۆت لە گەڵ خەڵکی ترا هەڵ ناسەنگێنی ماڵو سامانو، داهاتی وڵاتت، بە زۆر، ناقە بڵێنی. هەرچی نامۆو، لاوەییو، زۆرداری گزیکار پێت بـڵێ، مـلی بـۆ دادە

نـەوێنی. لە حـاندتەوس‌و تـۆانـج‌و پـلاری رەخـنەی دوژمـن، دە حـەبەسێیّ‌و، رادەمێنی، رەگ‌و، زیشەو، بنەچك‌و رەچەڵەكی داری ئاواتی گەل. لەبن دەردێنی. گوڵی هەستی كۆمەل بە پێخوستی خۆنەناسی پیّ شێل دەكەی‌و دەشەمزێنی. لە خەویشا، بیری خۆیی‌و مافی سورشتی‌و خوداپـیّداوی، نازاوێنی. جـوجكی برات، بە تێخوزینی دژ،لە بەر دایک هەڵ دەگری‌و، دەفرمێسكی قـەتیس مـاوی دایک‌و بابی، رانامێنی. كە روێشكی كەوی بۆ. نامۆ، نـەتەوی، لە كـۆزی، مـاڵی خێڵ‌و، هۆزت دەر دەكێشی‌و دانامێنی. بەڵام كاتیّ خۆت دەناسی، مەگین خودا، كەس، ناناسی، بە سەر بەرزی خۆ دەنوێنی. مل، بـۆزۆردار، نـاچەمێنی‌و سـەر دانانەوێنی. خزم و خۆییت لا، ماقوڵە، دژتكیّ بیّ ناماقوڵە. ئەوساكە بیر دەكەیەوە، رابراوت دێتەوە بیر. بیروكردەو گوفتارت، دەلاترازووی هەست و زانست دەخەی و، بە ئەندازەی سەری موویەك نایەڵی كـردەوەت، لە حـاست فەرمـانی خـوداو پێغەمبەرو، نەتەوو، زێدو، گەل‌و، هۆزت‌دا، سەر بكاو سوكبی. كـەواتـە لە بـەرا پێویستە خۆت بە باشی بناسی، تا غەیری خوا، هەمووكەس بە كەس نەناسی. بە شرۆڵی‌و بە پیّ خۆاسی: رەبەن، بێماڵ كەس نـەت نـاسی. دیسـانەوە، سـەر بـۆ دوژمنی مافخۆرو داگیر كەر،ناچەمێنی، هەتا ماوی هەرواده ژیوو، وادەمێنی.

پیاوی خودای نای دۆرێنی: بە هەشت‌وە زۆری دەستێنی، خەڵك رێزت لیّ دەنیّ‌و شانازیت پێوە دەكا، خوشیان دەوێی‌و حەزت لیّ دەكریّ، نامۆیی‌و، بێزت لیّ ناكریّ. بە باشی ناوت دەزریّ. پیاوەتی بە بە ژنت دەبڕیّ. خۆ نەناس چی پیّ نابڕیّ. خۆفرۆش خەڵاتی سوكی و چروكی پیّ دەبڕیّ، مەقەستی دەمی هەر خۆی دەبڕیّ: پیاوی سوك دەردی سووكی ناكێشیّ: زامی ئەندامی مردوو نائیشێی.

گزیكارە، فخورەكەی هەر ئەوەندەی رێزلی دەنیّ تا مەبەستی پیّ‌وە، دی دێنیّ‌و، سەری برای خۆی پیّ دەقرتێنیّ. چاوی براوكاڵی پـیّ لە كـاسەی سـەر دەردێنیّ. وەك تاجی‌و توڵەی دەرەبـەگ، تـا، لە زاو نـەكـەوتۆ وە، بـە زاراوەی زاوچی، شەگە نەبووەو، شان‌و پیلی نەگیراوە، پەنجەی لە خەنەدەگـریّ، لە نـاو كۆشكاجێگای بۆچادەكریّ. نۆكەر، دەباوەشی دەگریّ، خۆاردنی خۆشی بۆچێی

دەکرێ و،کولیچەی تایەبەتی بۆ سازدەکەن،جل و جۆرێ جوانی بۆ دروست دەکەن، ڕستەو، مەرەسەی ئاوریشمی بۆ دەهۆننەوە، قەلاتەی زێوینی بە زەنگولەی زێری دەمل دەکەن، بەلام پاش‌وەی لە، ڕاو وێستایەوە، لە خوێن ڕشتن گەڕایەوە: شانو، پیلی گیراو ملی ڕەق بوو: ئاغا بە بێپرس، بێ یەکو دوو: دەیخاتە بەرگەمالی پەز: نۆکەر چلکاو خۆرو چاپەز: بە حەلەلەو چەپلە لێدان دەی خنکێنن پاش تێر لێدان: ئەو سارە کێش ڕەکێش دەکرێ:

لە چالی بێ ڕێزیدا گۆردەکرێ: کە وابوو پێویستە ئەوانەی حەز لە بێگانە پەرستی و خۆنەویستی دەکەنو دەبنە هۆرەو پووازی شکاندنی داری ئاواتی گەلە موسولمانەکەیان بە خۆدابێنو، بیرکەنەوە، ڕێگای چەوتو خواری خۆ، بە کەم زانین وەلانێن و بێنەوە سەر ڕێچەی سوروشتی و،خواپەرستی خۆیان، گەل و نیشتمان و ئایین خۆشەویست بن. بۆ، نە یاری هۆزو زێدی خۆیان گوێ لە مستو، فەرمان بەر نەبن. تاوەکو بەلای هەموانەوە بە ڕێزو حورمەت بن، مێژوش بە سوکی ناویان نەبا، کۆمەل لە خۆیان هەل تاوێرن. مال و مندال لە بەریان نەبێزرینو ترۆیان نەکەن، بەلکوو، وەکو مەزن و ڕابەری خوایی و گەلی،سەیریان بکرێو بە ڕێزەوە لە مێژووی شانازیدا ناویان، ببرێ، خەلاتی خۆشەویستی، بە، بەژنو، بالایان ببڕێ،بەم هیوایەی بیرکەینەوەو، خۆمان، لە یاد، نەبەینەوەو، بزانین کێ بۆین و،کێن. و، ئەشێ چۆن بین.

| | |
|---|---|
| هرآن (دینور) کو، نه بردین بود | زیزدان و، منش، نفرین بود |
| یکی (دینور) بود، یزدان پرست | که هرگز نبُردی، به بیداد. دست. |

فردوسی علیه‌الرّحمه

# (ووشەی دینەوەر)

ئەم ناوە خۆی لە دوو بەش‌و دوو، ووشەی (دین) وە (وەر) واتە خاوەن، پێک هاتۆوە.ئاشکرایە بە دانیشتوانی رۆژئاوای ولاّتی ئێران بـە تـایەبەت دەورو بەری زنجیرە کێوەکانی زاگروسی بەر لە بەدیهاتنی ئایینی زەردەشت، گـوتراوە (دینەوەر) وەك، مامۆستا پروفیسۆر تەوفیق وە هبی لە بارەی ئایینی کۆنی کوردان دا دەڵێ:تـا،پـەیدابـوونی ئـاشۆ زەردەشت، خـەڵکی دەورو، بـەری چیـاکـانی (زاگرۆس) پێرەوی ئایینی (میترا)، (شیدا) یان شەیداو (دئێوە) بوون، و یەکێک لە پەریوو فریشتە گەورەو بەرێزەکانی ئەم ئایینانەکە فرشتەی (قەڵەم) بۆوە ناوی (دین)ە. دیارە هەر بەم بۆنەوە کەسێک هەیکەل‌و، تەشکی ئەم فرشتەی (دین) بە لاوە بو بیٚ پیێان گوتۆوە (دینەوەر،واتە: خاوەنی هەیکەلی دین: بەلام دوای ئەوەی ئایینە کۆنەکانیان وە لاناوەـئـایینی زەردەشتیـان وەرگـرت، شـوێنەواری ئـایینە بەرۆکان هەر بە لای ئەو کەسانەوە مایە وە: کە لە نـاوچە بـەرزو شـاخاوێکاندا دەژیان، وەك ئێزەدی (کە بە داخەوە لە بەر بیٚ ئاگایی تەنانەت خۆشیان هەر بە (یَزیدی) ناودەبەن.)

(شەیدا پەرست). (کە ئەمیش لە بەر، باش بۆنە چونوو بێئـاگـایی لە بـن

چینەی ئەم ئایینە، زۆر کەس لە نووسەرەکان، لایەن گرانی ئەم ئایینیە بە شەیتان پەرست ناو دەبەن.) یان (کاکەیی) گۆران عەلی ئەللەهی و ئیتر کە ئیستاش ووشەی داود، وە (دێو) بە لایانەوە زۆر ڕێزی هەیە [1] (هەلبەت مـن ئـەم مەبەستـانەم لە کۆتایی کتێبی (آداب و رسوم کردان)دا بە دریژی باس کردوۆە: کە لە لاپـەرەی ٢٠٥وە، تا ٢٣٧ بۆ ئەو مەبەستانە تەرخان کراوە، سەرە، ڕای پاش کۆی مامۆستا هەژاری رەحمەتی لە ژێر سەر دێری: (چی لە یەزیدی دەزانم) (٢٦٣، تا ٢٧٧) ئەوەش ئاشکرایە دوای هاتنی ئایینی زەردەشت

و بوون بە ئایینی رەسمی زۆر بەی ئێرانیکانو دەست بە پشتەوە دانو لایەنگری کردنی لە لایەن پادشاکانی ساسانیەوە، ئایینەکانی دیکە بە ئایینی دێو، بە واتای (ئەهریمەن) وا ئە: ئیبلیس ناو دەبردران، دیارە ئەو نێوە بۆ ناحەز نیشاندانی ئەو کەسانەی لە سەردەمەکانی رابردوۆە تا سەرەتای داهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەدراپاڵ ئەو کەسانەی لە بەرانبەر، دەسەلاّت دارێتی، کاتی دا، خۆیان دەگرت و گۆیان بە یاساو زاکونی میری نەدەدا، هەروەك لە شاهنامەش دا زۆر جار تووشی ئەو ناوە (دێو) دێن. هەلّبەت لە زەمانی صەفەویکانیشدا زۆر جار ئەو نـاوە بـە بەژنی کوردەکانی دژی میرایەتی ئەوان بڕدراوە،و،تەنانەت چۆتە نێو هێندێك لە کتێبە ئایینێکانیشەوە [2] و، ئێمەیان بە دێوزادە داناوە.

دیارە نووسراوەکانی مامۆستا عـەلی ئـەکـبەری، دێـخوداش، هـەر ئـەم واتایانەی سەرەوە، دەربارەی واتای ووشەی «دینەوەر» دەگەیەنن، کە دەنووسێ:

دینەوەر: خدەی لێك دراوەو، بە واتـای، خـاوەن دیـن»، (بـە ڕێـوەبەری فەرمانەکانی خودایی)

---

١ [ وێنەی کەل داوود، یا، دوکانی داوودی سەرپێلی ذەهاو، کە لە بەشێکی نـەخشەکـەدا. پیـاویکی (ماد ـ کوُرد) لە حالّەتی نزاو، پاڕانەوەدا، دەبیندرێ.]

٢ بە چەشنێکی تەواوو، بەربلاو، دەتوانین بێژین، ووشەی «دێو» نوینگەی هەمو چەشنە نـاحەزیو، خەرابیو دزێوێکەو، بە واتای هەمو هۆزیکی بێ فەری غەیری ئاری نەژادەو، هەر نامۆو لاوەیەکی هەندەران، بە «دێو» دەژمێرێ-هەربۆیەش تەهمۆریث لە شانامەدا، لەقەبی دێو «دێوبەندی، پێی دراوە، چونکو بە سەر غەیرە ئێرانیکانا زال بوو وخستێ بەندەوە.

هەرئاێ دینەوەر، کو، نەبەر دین بووەد
زی یەزدانو، مەنش، نەفرین بووەد
یەکی دینەوەر بوود، یەزدان پەرست
کی هەرگیز، نەبوردی بە بیداد، دەست.
(فیردەوسی طوسی)

بە پێی نووسراوەی «دائرةُالمعارفی ئیسلام» بە دیهاتن‌و، بنیات نانی شاری «دینەوەر» کە، لە سەر چاوەو، نوسراوەکانی «سوریانی»دا دینە هورە هاتۆوە، دەچێتەوە، بەر سەردەمی ئیسلامەتی‌و، ئەم شارە لە سەردەمی خەلافەتی خەلیفەی دوهەمیشا (رض) ئاوەدانترین‌و، خۆشترین، هەرێمی ولاتە شاخاوێکانی لای «هەمەدان» بۆوە.

لە شەرەکەی شاری «نەهاوند» واتە: فتح‌الفتوح:دا، ۲۱ هـ‌ق - ۶۴۲-م ئەم شارەش بە بێ بەربەرەکانی‌و، حەنگان، خۆی‌دا، بەدەست موسوڵمانەکانەوە،

پاشان ئەم شارە بە ناوی «ماةُالکوفە»وە نەهاوەند بە ناوی (ماةُالبصرە) ناویان دەرکرد: بناغەی شاری «دینەوەر» هەر لە سەردەمی مادەکان‌دا، دارێژراوەو، بە یەکێك لە شارە هەرە خۆش‌و، زەنوێرەکانی «مادستانی گەورە» ژمێردراوە،.

لە زەمانی «سلوکێکان»دا کۆمەلێك یۆنانی هێندراونەتە، ئەم هەرێمەو، لە وێدا، ماونەتەوە. لەم، زەوی کوڵینانەی دواییدا، حەوضێکی بەردینەی چکۆلە دۆزراوەتەوە، کە بە وێنەی سیلێنوس‌و، ساتیرەکان، ڕازێندراوەتەوە، دیارە ئەم وێنانە، ئەمەمان بۆ، ڕون دەکەنەوە کە پرستنی خوای یۆنانی «دیۆنوس» بە هۆی ڕابەرە ئایینێکانی یۆنانەوە، هاتۆوە ناوچەکەو، و، بۆتە جێگەی ڕێزو،پرستنی خەلکی کوردی ئەوسەردەمە، دیارە مەعبەدی ئاناهیتاش هەرهی ئەو، سەردەمەیە: وەك ڕامان گەیاند، ئەم شارە «دینەوەر» هەر لە سەرەتای ئیسلامیشەوە، تاکۆتایی خەلافەتی موقتەدیر، (مقتدر ۳۲۰ هـ‌ق ) خاوەن شکۆو، ئاوەدان بۆوە، بەلام لەم سەردەمەدا، کە مەرداویج «مەردئاوێژ ۳۱۹ هـ‌ق » ئەم

شارەی گرت‌و، پاشان نزیکەی ٢٥٠٠٠ کەس لە ناو چوون، ئـەم شـارە رۆی لە وێرانی کرد، تا ئەوەی «حەسەنوەی کورد» لەم ناوچەیەدا مـیرایـەتێکی سـەربە خۆی پێك هێناو، شارو، ولأتەکەی ئاوەدان کردوە، پـاش نەمـانی‌حە سـەنوەی (٣٦٩ ھ ق ) بە هۆی ناکۆکی ناوخۆیی‌یەوە دیسانەوە، بەرەو، خەراپی رۆیی، تا ئەوەی تەتیموری لەنگ، بە شوین مەغولەکانی تراله چەرخی حەوتەما هات‌و، ئەم شارەی بە تەواوەتی خاپورکرد:[١]

## (باری هەڵکەوتنی دینەوەر)

هەروەك ابنُ‌الحوقل، ابنُ‌الفقیە، بلاذری جەعفەری ابن قدامە، ئەحمەد ابن حنیفە (دینەوەری) حافزحوسێنی تەبریزی، عەبدولخالەقی بەغدادی، ابوالفیدا، موستۆفی قەزوێنی لیسترێنج‌وە کەسانی دیکەش لە نووسراوەکانی خۆیاندا رایان گەیان دوە شاری لە مێژینەی (دینەوەر) کەوتۆتە لای چەپی شاری (هەمەدان) وە لە ٢٠ فەرسەنگی ئەو داهەڵکەوتوە. لەوێوە تـا شـاری (مـەراغـە) واتـە شـاری مادراگەی چکۆلە (ئاذربایجان ـ ئاترۆپاتێن) ٦٠ فەرسەنگ‌و، تـا شـارە زوور، (شاری قەلأچووالان)ی لای شاری سولێمانی کوردستانی ئەو دیو ٤ قوناغ بۆوە.

دینەوەر شارولکەیەکی زۆر خۆش و زەنوێرو دلگیر بۆوە. ئێستاش دێیەك هەر بەو ناوە کەوتۆتە بەشی شـاری (صـەحنە)وە کـە ئـەم ئـاوایـیە یـادگارو پاش‌ماوەی شاری کۆنی دینەوەرە.

ئەم شارە یەکێکە لە شارە کۆنە کوردنیشنەکـانی روژئـاوای ئـێران کـە لە سەردەمی شایەکانی (ماد) و (هەخامەنش)و (ئەشکانیش)دا هەر هەبۆوە. دیارە شوێنەوارێکی زۆریش کە سەر بەم سەردەمانە بۆوە لەوێ دۆزراوەتەوە تەنانەت ماوەی چەند سال بازاری شاری (هەمەدان)و (کرماشان)و هەروەها زۆر شوێنی

١ ص ٥٨٥ ژمێرەی پیتی د: بەشی ٤: فەرهەنگنامەی دێخودا:

ئوروپا بە کڕین و فرۆشتنی ئەم شتە عەنتیکانەی لەوێ دۆز رابوونەوە، گەرم بووە.

رونی گیرشمن: لە کتێبی (ئێران هەر لە سرە تاوە تا دەگاتە سەردەمی ئیسلامەتی)دا جێگەی: سەربازەکانی ئەسکەندەر لە دەشتی کرماشاندا کە ئەوسا کەپێی گوتراوە (بانەسا)[1] بە جێگەی لە دایك بوونی (دێوسێوس) واتە: خودای یۆنانیانی لە قەڵەم داوە، کە ئەم خودایە هاوپلەی (باخۆسی) ڕۆمی بۆوە، وە زۆر شت لەم سەربازانەوە بە جێماوە کە ئێستا لە (دینەوەر) و (کەنگاوەر)دا دەبین درێ.

مامۆستا حوسێن مشیرالدولە: لە کتێبی (ئێرانی باستان)دا دەڵێ: دینەوەر،و شارەکانی دیکەی کێوستانی (ئێراقی عەجەم) دوای ئەسکەندەری ڕۆمی تا هاتنەسەرکاری (ئەردەشێری بابەکی ساسانی) کە (ئەردەوانی)پێنجەمی کوشت لە ژێر دەستی گەلێک پادشای گەورەدا بوۆە کە حوکومەتیان بە سەر پادشا چووکەکاندا کردوۆە، دیارە (دینەوەر) لە سەردەمی ساسانیدا ناوەندی پاریزگای ناوچەی ڕوژئاوای ئێران بووەو، شارو ناوچەی کرماشان واتە قورمەیسین یا (خورمەیشین)یش سەر بەوی بوۆە.

هەر، لەوێشدا (بارامی چوبین)و (پەرویزی) کوڕی هورمز لە ساڵی ۴۵۹ – ۴۸۴ زایەنیدا بە شەڕهاتون. لە کۆتایی حوکومەتی ساسانیدا خوڕمێکانیش خۆیان خزاندبوۆە ئەو ناچەیەوە: ئیداوار بڕاوون: لە کتێبی تاریخی ئەدەبیاتی ئێران‌دا) دەلێ: (هەڵبەت لە زمان خواجە نظام‌الملك‌وە) لە سەردەمی بوزورگمیهر،دا، خێزانی (مەزدەك) دوای کوژرانی مێردەکەی لە سەر فەرمانی (ئەنۆشیروانی) ساسانی و، خواستی مۆبێدەکانی زەردەشتی، دەگەڵ دو کەس، لە ویستیارانی

---

١ ئەوەشمان لە بیر نەچێ. بەیت‌و، چیروکێك، هەر بەم ناوەوە (بانەسا، یان بە هنەسا) دەربارەی شەری موسوڵمانە عەرەب‌و، کوردەکان، لە سەردەمی ئیسلامەتیدا، دانراوە، کە (من) لە ساڵەکانی ۱۳۳۳ - ۱۳۳۲ هـ ش کاتێ لە ئاوایی (سیلوێ) محالی بەرنبەی لاجانی پیرانشاری ئێستا،دا دەرس خوێن بوم، لە شەوانی سێشەموو، هەینی دا، لە لایەن فەقێکانەوە دەخوێندراوە دیومە: بەلام لەوساوە چاوم پێی نەکەوتۆتەوە.

مەزدەك، دا لە شاری (تیسفۆنەوە)، دێن بۆ شاری (ڕێ) بۆ پەرە پێدانی ئـاییـنی مەزدەك.

ئاشکرایە، ئەم ئایینە لە پاشان هەر بە ناوی ئەم ژنەوە کە ناوی (خوڕەمە) بۆوە، ناوی دەرکردۆوەو ، پێی گوتراوە ئایینی (خوڕەمی)

دوای ئەوان (ئەبو موسلیمی) کوردی خۆراسانی، لە سەردەمی خەلیفەکانی بەغدا،دا، سەر لە نوێ ئەم ئایینەی‌وە برەو، خستەوە. جا هەروەك ڕابرا، ئەم ئایینە، لە بەرا، بە ناوی خوڕەمەی ژنی مەزدەك ناوی دەر کرد بوو، بەڵام پاشان خەلیفە عەڕەبە عەبّـاسی‌یەکـانی بـەغدا، ئـەم نـاوەیان‌دا، پـاڵ بـابەکـی خـوڕەم دیـنی (مەمێندیوە)و[1] تاپێستاش هەر بە ناوی ئـەوەوە، کـەوتۆتە سـەرزارو، لاپـەڕەی کتێبەکانەوە.

## (دینەوەر لە سەردەمی ئیسلامەتیدا)

هەروەك ئەحمەدی کوڕی یەحیای بەلاذری لە کتێبی «فتوحُ‌البلدان»دا کە لە سەدەی سێهەمی کۆچی مانگیدا، نووسیوێتی دەڵـێ: (ئـەبو موسـا ئـەشعەری) لە کـاتی گەڕانەوە یا لە گرتن‌و، موسڵمان کردنی خەڵك‌و شاری (نەهاوەند)و، دەوروبەری، بە خۆی‌و، سوپایەکی یەکجار زۆرەوە کە هەموویان خەڵکی شاری (بەصرە) بوون، دەگەڵ (نوعمانی) کوڕی (موقەڕەن)دا، خۆیان گەیاندە شاری (دینەوەر)و، پاش شەڕێکی زۆر توندو تیژی پینج شەوو، ڕۆژە، کوردەکان، کەوتنە وتـوویژ کـردن دەگەڵ ئەبوو. موساداو، ئایینی لە مێژینەی خۆیان (زەردەشتی)وە لا، ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامیـان وەرگـرت، پـاشان ئەبووموسـا لەوێـوە روی کـردە شـاری (ماسبـذان) (کە یەکێك بۆوە لە شارەکۆنەکانی پێشکۆی لوڕستانی ئەو سەردەمە، لە ناوچەی (طەرحان) لە لای ڕاستی ئاوای ڕۆباری (سـەیمەڕە)وە. (ص ١١٣

---

١ (مەمێند)، ئیستا ئاواییەکە لە ناوچەی شارویرانی (مهاباد)و سندوسی شاری (نەغەدە)دا

کتێبی کرمانشاهان و کوردستان)

دوای ئەوە دیسانەوە، ڕادەگەیەنێ و، دەڵێ: ساڵی ١٩ی کۆچی مانگی کاتێ یەزدی گوردی سێهەمی ساسانی لە، شاری (حەلوانی) لای سەرپێڵی زەهاوی ئێستا، ڕای کرد، ئێرانییەکان، بە تایەبەت خەڵکەکانی شاری (ڕێ) قومەس دامەغان، (ئیصفەهان)، هەمەدان، نەهاوەند،و، دینەوەر، بە پەیام و، نامە پێکەوە پەیمان و: بەڵێنیان بەست،و، چەند نوێنەرێکیان، نارده لای یەزدیگورد (لە ساڵی بیستەما)و، مەردانشای ئەبرۆبەند (ذی‌الحاجب)یان، کرده سوپاسالار،و، فەرماندەری خۆیانو، لە شاری (دینەوەر)دا، کۆبوونەوە، بەڵام کاتێ (ئەبوموسا)و، (مالیکی) کوڕی حارثی ئەشتەری، هانی کوری عەلقەمە، بە چەند هەزار سوارو، پیادەوە، کە لە بە را، هاتنە حەلوان. پاشان لەوێشەوە بە ڕەو، دینەوەر، بە مە بەستی سەر کوت کردنی کوردە شورشگێرەکان، بە ناوی ڕێگرو، چەتەو، پیاوکوژو، لەرێ لادەرخزین، ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە (کوردەکانی دینەوەر) لە کاتی خۆیدا، یارمەتێکی هەرە گرینگو، بەر فراوانی ئەبوومۆسلیمی کوردی خوراسانیان داوەو، ئەو مەڵبەندە، لە سەر دەمی خەلیفەکانی بەغدا،دا، پە ناگایەکی زۆر هێمن‌و، قایمی لێ قەوماوە پەنابەرەکان بووەە واتە: کاتێ ئەبوو موسلیم بۆتیکەوە پێچانی حوکومەتی عەباسی: لە ساڵی ١٦٩ی کۆچیدا، را،دەپەڕی‌و، دێتە دینەوەر،مەهدی عەباسی لە بەغداوە دێتە ، قۆرمەسین، خۆرمەشین (کرماشان) کە ئەوسا کە، سەر بە دینەوەر بۆوەە بۆئەوەی دەگەڵ کوردەکاندا، کە ئەو کاتەش سەریان بۆ عەبّاسێکان دانە، نەواندبوو، وتووێژ بکاو، لە پاشان بە درۆهەڵیان خەڵەتێنێ‌و، سەرۆکەکان بگرێو، دوریان خاتەوەە پاش ئەوکارە ساتە، هارون‌الرّشیدی کوڕی مەهدی بوّە فەرمأن ڕەوای ناوچەی کوردستان‌و، هەرێم گەلی ڕۆژئاوای ولات، بە کورتی لە زەمانی مەهدی عەباسێوە ١٦٩ تا سەرەدەمی تەیموری لەنگ ٧٩٥ (٨٠٧ – هـ. ق )، دینەوەر هەمیشە جێگەی شەرۆ، لێك‌دانی کوردو، دوژمنی زۆردار، لە عەرەب‌و تورك‌و،فارس بۆوە. بۆوێنە لە ساڵی ٣٣٩دا کە مەنصوری کوڕی قەراتەکین، هەموو ناوچە، شاخاوییەکانی تا قۆرماسین،

گرتبوو، لەو لاشەوە، رکن‌الدولە، فەرمانی کوشت‌و بڕی تورکە سەربزێوەکانی دابوو، (معزّالدّولە) نامەیەك دەنووسێ بۆکوڕی أبی‌الشوک، لە میرانی کوردی دینەوەر. ئەویش هەڵی کردە سەر تورك‌و راوی نان، تا گەیاندنیٚ دەوروبەری «موصلٚ» «نەیتەوا» لەساڵی ۳۴۲دا، هەرئەم ابی‌الشوکە، تاقمێکی لە نوێنەرانی حوذەیفەی عەباسیٚ لە لای دینەوەردا گرت‌ویە خسیری کردن، ئەوەش بلێن، عەباسی هەر بە ناو، فەرمان رەواتیەتیان بە سەر ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانا، هەبۆوە. ئەگینا هەموو کارو، باری ولاٚت لە دەست خودی میرە کوردەکان‌دا بۆوە. بۆوێنەە لە ساڵی ۳۳۰دا، ئەمیر حوسێنی بەزیکانی سەرەك هۆزی کوردی شارەزور، کە پیاوێکی گەلێك ئازاو، نەترس بۆوە هەموو ولاٚتی سەر بە شارەزوورو دینەوەری لە ژێر دەسەلاٚت‌دا بۆوە. بە چەشنێکی واکە خەلیفەی عەباسی بە تەواوەتی لیٚ دەکە وێتە ترس‌و لەرزەوە لە ئاکامدا سوپایەکی گەلێک قورس و زۆری دەنیٚ رێتە سەر، بەلاٚم میرحوسێنی ناوداری کورد، ئەم سوپایە شپرزە دەکاو تێک دەشکێنیٚ.

لە ساڵی ۳۳۸ کۆچی مانگی‌دا، پاش ئەوەی ئەمیر حوسێن فەرمانی خودا بەجیٚ دێنیٚ (بەدر)ی کوڕی دەبێتە جیٚنشینی باوکی. دیارە ئەم کوڕە گەلێک لە باوکی خۆی بوێرترو ئازاتر بووە معزّالدولەی ئالی بویە ترسی رێنیشت‌و (یەنالٚ گۆش)ی فەرماندەری هێزی گشتی سوپای خۆی، بە سوپایەکی تەیارو پر چەکی عەرەبەوە ناردە سەر. بەلاٚم پاش لێک دان و پێك‌دا،دانێکی زۆر توند، ئەم میرەکوردەش سوپای (یەناڵی) شپرێوکردو بەرەو بەغدا راوی‌نان. پاش ئەم تێك‌شکاندنە (ئەمیر بەدر) تا،زێی گەورەی نێوان شاری (هەولێر) و (موصلٚ)یشی خستە ژێر دەسەلاٚتی خۆیەوە بەو پیٚیە، دەتوانین بلێن یەکێک لە راپەرینە هەرە گەورە نەتەوایەتیەکانی ئەو سەردەمە کە مێژو، بەرێزەوە ناویان دەبا راپەڕینی کوردەکانی بەرزیکانی یە، کە بە سەرۆکایەتی ئەمیر حوسێن‌و ئەمیر بەدری (حەسەن وەیە) کە لە نزیکەی ساڵەکانی ۳۳۰ تا ۳۳۸دا، (لە دینەوەر) (نەهاوەند و هەمەدانـدا) روی دا. حەسەنوەیە پیاوێکی زۆر خاوەن هۆش و

ئاوەزدار بۆوە. (قەلآی سورماج)[1] کە هەر لە سەردەمی ساسانێوە بە هۆی بارودوخی تایبەتی، جێگەی سەرەنج بوو،دوبارە ساز کردەوەو، کردێیە جێگای دانیشتنی خۆی. ئەم میرە مەزنە کوردە، لە سەردەمی فەرمانرەوایەتی خۆی‌دا (٣٣٨ - ٣٢٠) دینەوەری لە هەموو بارێکەوە بە تایبەبەت باری کشتو کالو ئاینیوە زۆر بەرەو پێش برد. مەزگەوتی گەورەو خوێندنگای زۆری تێدا بنیات‌نا، لەوێوە کە رەسەو، شتومەکو شتی پێداویستی هەمووسالێک دەنارده شاری (مەکّەو مەدینە)ی بەرێزو خۆشەویست. پاش هەژدە سال میرایەتی لە سالی ٣٣٩دا، دنیای جێ هێشتو رووی کردەوە بەر بارەگای یەزدانی مەزن

## سووتاندنی دینەوەر
## بە دەست تەیموری لەنگ

هەر وەك شرف الدين عەلی یەزدی لە لاپەرە ١٩٩ ظفرنامەدا، وە هەروەها نظام‌الدینی شامیش لە لاپەرەی (١٢٩وە، ١٣٠وە، ١٤٢و ٢٤٥و ٢٤٦)دا دەلێ: وە هەروەها ئەمین زەکی بەگ لە بەرگی دوو هەمی کوردو کوردستان،وە خولاصەی مێژووی کوردو کوردستان بەرگی یەکەم‌دا بە کورتی دەلێن: تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی مانگی کە کوردەکانی ئەییووبی توانی بوویان تەنانەت لە مصروشام، کوردستان، یەمەن‌و، خۆراسان‌دا چەند سەر بە خۆیی چکۆلەی ناوچەیی بە دی بێنن،وە تا دوای کوشتنی (جلال‌الدین خوارەزم شاهی) لە سالی (٦٢٨ی هـ. ق) کە خەریکی لێدان و کوشت برۆ، لە باشوورو باکووری کوردستان‌دا، مەغوولەکان پێیان نە نابوۆە ناوچە کوردنشینەکانەوە، بەلام لە سالەکانی ٦٤٥وە تا ٦٤٨ بە پێی یاسای کوشت و برو سووتاندنی خۆیان دەتوانین

---

١ سورماج ئێستا کە دێیەکە لە نێوان شارۆلکەی بێستوون‌و هەرسین‌دا. لاپەرەی ١٢٣ پێشەکی: کتێبی (کرمانشاهان و کوردستان) د.م. گۆلزاری

بلێین زۆربەی شارو شارۆلکەو ئاوەدانیکانی کوردەکان کەوتە بەر هێرشی ماڵ وێران کەرانەو، وسووتمانی مەغوولەکانەوەو، ئەوانیش لەم وێرانە، ماڵیدا، بێبەش نەبوون:

دیارە لەم هێرشانەدا زۆربەی خاچپەرستەکان کە دوژمنی لە مێژینەی کوردەکان بونەوە لە سەرەتای دامەزرانی میرایەتی ئەیوبیەکانەوە بیوونە نەیاری کورد، یارمەتی هۆزی مەغوولیاندەداو لە ئاکامدا کوردەکان وەك هەمیشە کە چیا سەر بەرزەکان گەورەترین پاڵو،پشتیان بوّوە هانایان بردە بەرئەو کێوانەو، لەوێدا خۆیان سەقام گیر کردەبەلێ؛ پەندی پڕ بایەخی پێشینانە: کورد، لە تەنگانە،تەلانی، لانە: لە ساڵی ٦٥٥ ھ. ق شاری (وەهار) بەهار کە کورسی فەرمان ڕەوایەتی ناوچە کوردنشینەکان بوو، وە هەژدە ناوچەی کوردنشینی هەر لە هەمەدانو نەهاوەندو تووسیرکانو ئەسەدئابادو دینەوەرو ، کورمانجشاهان و کوردستان و شارە زوورەوە بگرە، تا دەگاتە دیار بەکرو جەزیرو بوّتان لەم لایەشەوە تا دەگاتە لورستانو اصفهان و شاری (ریّ) لە ژێر دەسەلاّتی ئەم شارەدا بوون، وەدەس کۆری (تۆدان) واتە: باوکی ئەمیر (چۆپان) کەوتو، ئاگری تیّ بەر درا. ئەو شارە لە ساڵی ٧٠٦ دا کە (اوڵجای تو) واتە، خودابەندەی سوڵطانیەی زەنجان، ببوّوە جیگەو مەکۆی کۆکرنەوەی سوپایی ئەو شایە بوّسەر ناوچەکانی گیلاّنو شۆینەکانی کە. دیارە هەر لە سەردەمی ئەم شا، بنەچەك مەغوولەدا شارێك بە ناوی (سوڵطان ئاباد)ی چەمچەماڵ لەخوار کێوی (بێستون)دا بنیات نرا کە جیگەی شاری بەهاری کاولکراوو سوتێندراوی گرتەوە، هەڵبەت ئەو شارەش لە سەر شوینەواری شارێکی کۆنی سەردەمی (ساسانی)و (پارتی) دامەزرێندرابوو. کاتیّ ئەمیر تەیمووری گورگانی لە ساڵی (٧٨٩)دا هێرشی کردە سەر ناوچەکورد نشینەکان، ئەویش بە چاولیکەری لە باپیرە گەورەکانی خویّ واتە: تۆرەمەی چەنگیزخان، کوشتوکوشتارێکی زۆری لە کوردەکان کرد، وە بە واتەی (نیظامی شاهی) لە سەری ژنو منداڵو پیرە پیاوو، ئازاو دلێرەکانی کورد تەپوڵکەی ساز دەکرد. لە ئاکامدا شاری دینەوەریشوەك زۆربەی شارەکانی دیکە کاول کراو

سوتێن‌درا. بەلاّم هەروەك شامی لە ظفرنامەکەی‌،وە لە لاپەرەکانی ٢٤٥و ٢٤٦دا دەڵێ: ئەو کوشت‌و کوشتارە بێبەزەیانەی تەیمووری لەنگ هەرگیز نەی‌توانی کوردەکان بە چۆکدا بێنێو دەستیان پێ لە بەر بەرەکانی هڵگری‌و کاتێ‌دەرفەت بێنن، هێرش نەکەنە سەر سوپای تەیموورو تاقمێکی زۆریان، لە مەیدان‌و بەرەی شەڕدا، نەگەو زێنن‌و، لە خوێنی پیسیان‌دا شەلاڵیان نەکەن. بۆوێنە لە سالّی
٨٠٣هق‌دا، کاتێ تەیموور لە (بەغداوە) رووی کردە (آذربایجان = ئاترۆپاتێن) هەر دەگەڵ گەییشتە ناوچەی شارە زوور، کوردەکان، وەکو بەوری بەیان هەڵیان کردە سەر سوپای تەیموور و کوشتارێکی زۆر بێ بە زەیانەیان لێ کردن[1].

## (دینەوەر لە سەردەمی حەسەنوەی‌دا):

هەروەك لە پێشەوەش‌دا ڕامان گەیاندە یەکێك لەو شۆرشانەی کە هەرگێز مێژوو ناتوانی بیخاتە نێو فەراموشخانەی لە بیر چوونەوەوە، شۆرشی کوردەکانی بەرزێکانی (بەرزەکانی)یە ئەو شورشە بە سەر کردایەتی (خەسەنوەی) کە سەر هۆزی لکێك لە کوردەکانی بەرزێکانی بە ناوی (بەرزینی) بوۆوە پێکهاتوو لە شارەکانی (دینەوەر)و نەهاوەندو هەمەداندا) پەرەی ستاند. هەڵبەت هێندێك لە مێژوو زانەکانی کورد وەکوو (ماموستا محمدامین زەکی بەك) لە کتێبی (تاریخ‌الدول و الامارات‌الکردیە) چاپی قاهیرە بەرگی یەکەم لاپەرەی ٦٨دا دەڵێ: سەرزنجیرەی ئەم بنە ماڵەیە (حەسەنوەی) (ئەمیر حوسێنی) بەرزینی) باوکی حەسەنوەیە، کە حەسەنوەی لە سالّی ٣٣٠ ه.ق‌دا دەرفەتی لە بێ، سەرەو، بەرەیی‌و بێ هێزی فەرمان‌رەوایەتی خەلیفەکانی عەباسی لە هەرێمە کیوستانێکانی کرماشان و لورستان‌دا هێناو، ئەم زنجیرەیەی دامەزراند کە لە پاشان هەر بە ناوی ئەوەوە

[1] بەڵێ ، جیگەی مست پێلاقەیە:

واتە (حەسەنوەی) نێودێر بوو.

حەسەنوەی پیاوێکی زۆر بە بیرو ڕاو، خاوەن خوو خدەیی پیاوانە بوو (قەڵای سورماج) کە لە ڕۆژگاری ساسانیەکاندا یەجگار زۆر خاوەن شکۆە بوو سەر لە نوێ بنیات ناوەو کردێ جێگەی فەرمانرەوایەتی خۆی. مەزگەوتی گەورەی شاری دینەوەری دروست کرد کە هەتا بڕانەوەی دواهەمین میرایەتی ئەو زنجیرەیەهەر بە جوانیو ڕازاوەیی، بوّوە. (قازی ئەحمەد غەفّاری قەزوێنی) لە کتێبی (جیهان ئارا)دا، لە لاپەرەکانی ١٦٧و ١٦٨دا سەبارەت بە حەسەنوەی دەڵێ: حەسەنوەی کوڕی حوسینی بەرزەکانی لە سەردەمی (رکن الدولە) سەرەك وەزیری خۆی واتە (ابوالفضل) کوڕی (بوّیە)دا، بە بەرزترین پلەی سەرکەوتن گەییشتبووە بە جۆرێکی وا،هیچ چەشنە بایەخێکی بۆ رکن‌الدولە، دانەدەنا. هەر بۆیەش (رکن‌الدولە) سەرەك وەزیری خۆی واتە (ابوالفضل) کوڕی (عەمیدی) بە سوپایەکی زۆر قورسەوە لەساڵی ٣٥٩دا ناردە سەر حەسەنوەی، دیارە ئەویش زۆر زیتو، وریا، یانە چەند کەسێکی بە نێوی ناوبژێوّە ناردە لای رکن‌الدولەو لە ڕێگای ئاشتێوە لە گەڵی داپێک هات. حەسەنوەی پیاوێکی یەكجار زۆردەستو دڵ ئاوا ڵەو، خێروّمەند بوو. هەموو ساڵێ دراو، و ماڵێکی زۆری لە ڕێگای خودا دا بە سەر هەژارو، رەبەنەماڵاندا، دەبە شێوە. ئەم پیاوە باشە کوردە لە ساڵی ٣٦٩دا ڕۆژی سی شەمو سێهەمی مانگی ربیع‌الاول،کۆچی دوایی کرد.کوڕەکانی ئەو بە ناوی (عبدالملك، - بختیار، - ابوعدنان،- عاصم،- عبدالرزاق،-( ابوالعلاء، و ابوالنجم) واتە (بەدر) لە دوای باوکیان لە جیاتی ئەوەی وەك برا پشت بە پشتی یەکەوە دەنو دەستی یەکێتی بخەنە نێو دەستی یەکترەوە، تۆوی ناکۆکیان لە نێوان خۆیاندا، چاندوو دەستی یارمەتیان بۆ سەرکوت کردنی یەکتر بۆلای دوو ئەمیری دەیلەمی واتە،(غضدالدّولە وفخرالدولە) راکێشاو پەنایان بردە بەر ئەوان. تەنیا کوڕێك کە لە جێگای باوکی کە لە (قەڵای سورماج)دا ماوە بەختیار بوو. دوای کۆچی حەسەنوەی ناکۆکی کوڕەکان لە لایەکەوەو بلاو بوونەوەی ناوی خەزێنەو نەغدینەی قەلای سورماجیش لە لایەکی دیکەوە بوونە هۆی ئەوە کە عضدالدولە

هێرش بێنێته سەر دینەوەرو ناوەندی فەرمانڕەوایەتی زنجیرەی حەسەنوەی. ئەوە بوو لە ڕۆژێ سێیەمی مانگی ذیالحجەی ساڵی ٣٦٩دا، واتە: هەر ساڵی وەفاتی خەسەنوەی بە سوپایەکی گەلێك زۆرەوە، لە بەغداوە هاتە شاری (حەلوان): (دیارە ئێستا شوێنەوارێك لەم شارە نابین درێ.بەلام بە پێی نووسراوەی مێژوو نووسەکانشارێکی سەردەمی ساسانی بوەو تا چەند ساڵیش دوای ئیسلام هەر هەبوە. ئەویش لە نزیك شاری (سەرپێلی ذەهاوی) ئەمرۆدا پاشان هاتە نزیك شاری خۆرمەشین(کرماشان)و لەوێ ئوردووی مۆلدا، کۆرانی حەسەنوەی خۆیان خستە سەراپەردەی ئەوەوە. عَضُدُالدّولەش فەرمانی دا گشت کورەکان تەنیا (بەدر) نەبێ بخەنە بەندیخانەوەو کۆتو زنجیریان بخەنە دەستو پێوە. بەلام (بەدر) ابوالنجم تکای بۆ براکانی کەی کرد بەلان عضدالدّولە هەر عاصم و عبدالملکی جەبە کردو، ئەوانی دیکەشی کوشت. دوای ئەوە هەریمەکانی سەر بە دەسەلات دارێتی حەسەنوەی خستەوە ژێر فەرمانرەوایەتی (بەدر)وە،پاشان هەموو خەزێنەو نەغدێنەو شتە عەنتیکەکانی قەلای (سورماجی) بۆ خۆی بە تالان بردبۆ(بەغدا) دوای گەرانەوەی عضدالدولە بۆ بەغدا ابوالنجم (بەدر) کوری حەسەنەوی (٤٠٥- ٣٦٩) ه. ق. سەر بە خۆییکی باشی پێ کە وەناو دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی ولاتو تەواو کردنی کارە ناتەواوەکانی باوکی [1] پاش ماوەیەك (بەدر) لە لایەن عضدالدولەوە نازناوی (لقب) ناصرالدینِ‌وَ الدّولەی پێ درا. عاصمی برای بەدر، کە بە تکاو نزای ئەم لە دەس عضدالدولە رزگار بیوە دەستی کرد بە بەربەرەکانیو دژایەتی لە گەڵ بەدری برای،دا،بەلام هیچ سوودێکی لەم بەر بەرەکانێ وەر نەگرتو تێشکا.

لە ئاکامدا، بەدر توانی بە سەر هەموو کەندو،کۆسبو، ئاژاوەکاندا زاڵ بێ، توانی هۆزو خێلەکانی خۆی بە باشی رابێنێ. شتومەكو خواردەمەنی و کەرەسەی پێویست زۆر عادلانە بە سەر خەڵكدا، دابەش بکا. (بەدر) کردەوەی

١ تاریخ‌الدول و الامارات الکردیّە ئەمین زەکی بەگ ص ٧٥ ـ ٧٧و ٧٨ کوردو پەیوەستەگی نژادی او رەشید یاسەمی ١٨٣ الکامل ابن الاسیر جلد ۴ ص ۴٠٥ و وفیّات‌الاعیان، ابن خلکان ج ٣

چاکیٴ یەکجار زۆر بوٚوە. بوٚوێنە دەتوانین ناوی پرذیکی زۆر گەورە کە لە ماوەی دەساڵدا ساز کراوەو، ئێستاش شوێنەواری هەر ماوەناو، بەرین. ئەو پردە سەر بە شاری (آلیشتەر)ە (کە شاروٚلکەیەکە لە هەریمی حەسەنوەند-ناوەندی بەشی (خرّم‌آباد) کەکەوتوٚتە ٥٤کیلومیتری باکوری خورّەم‌ئابادەوە. آلیشتەر لە سەدەی چوارەمی کوچی مانگی‌دا بە شیٚك بوٚە لە بەشەکانی حەسەنوەی . ابوالنجم بەدر کوڕی حەسەنوەی لە سەر رووبار (چەم)ی کەشکان، ئەم پردەی هەڵبەستوٚوە،کە ئێستاش شوێنەواری هەر هەیە. بەلاّم هێندێك لە چاوەکانی تێك رووخاوەو شانە کانیشی تێك تەپیوە (تەتەڵە)و، کەتیبەکەی واتە: بەردە نوسراوەی ئەم پردە لە ویشکایی لای راستی ئاوی چوٚمەکەدا بوٚوە. بەلاّم ئێستا ئەم بەردە نووسراوە لە شاری خورّەم‌ئابادەو، لە دانیشسەرای سەرەتایی ئەو شارەدا، راگیراوە. پێویستە ئەوەش بڵێین کە (دوٚموٚرگان) هەشتاو پێنج ساڵ بەر لە ساڵ ١٣٥٧ی کوٚچی هەتاوی‌دا، ئەم تەتەڵەیەی دیوە. بەلاّم وەك لە بیرەوەریکانی (یادداشت) خوٚی دا (٢٩ ماهی مهی ١٨٩١ زائینی‌دا) رایگەیاندوٚە لای وابوٚوە ئەم پردە خاوەن شکوٚیە لە لایەن عەرەبەکانەوە بنیات نراوە لاشی وابوٚوە ئێرانیکان چەند ژا، ویستوویانە ئەو پردە نوٚی کەنەوە،بە لاّم زوٚر ناشیانە دەستیان تیٚوەرداوەو، نەیان توانیوە بە ئاکامی بگەیەنن. ئاشکرایە هویٚ ئەو بە هەڵەچوونەی «دوٚموٚرگان» هەر ئەوەیە کە تەتەڵە کە بە خەطی کوٚفی نوسراوەو ئیتر سەرەنجی نە داوەتە دەقی نووسراوەی ئەو پردەگەورەیە کە بەم جوٚرەی خوارەوە لە سەربەردێك بە درێژایی Cm ١٥٠ بەرینانی ٩٠ سانت‌وە ئەستوورایی ٢٧ سانت کە لە حەوت دێردا هەڵ‌کەندراوە.

١ : بِسمِ‌الله الرّحمن الرّحيم هٰذٰا ٢ : مأاَمَرَناٰ بِيناٰ ئِهِ‌اَلاميرُالاءجَلُّ اُبو ٣ : النجم بَدْرّبْنُ حَسَن‌وَیْهِ بْنِا_ ٤ : لْحُسَّينَ أطْاَل‌الله بَقَاٰئه سَنَةَ ٥ : تِسعٍ‌و ثَلَماٰنينَ وَثلاثماٰٰۃٍ وَ فُرِغَ [٣٨٩ هـ ق ]: مِنْه سَنَةَ تِسْعٍ وَ تِسْعينَ وَ ثَلثماٰة (٣٩٩ هـ ق )
٧ : وَتَمّ خِلاٰلَ عَشْرِ سنينَ اَناٰبَهُ‌اللهُ عَنْهُ. ئەم تەتەڵەیە کە بە نیٚوی (بەدر)وەیە ئەم راستەقانییە، بوٚ ئێمە دەر دەخا کە ئەم میرە کوردە مەزنە،تاچ رادەیە ك هوٚگرو

ئەوین‌داری راڤەو خزمەت کردن بە گەلەکەیووە خەڵقی خودا بۆوە.[1]

بەلاَم لە سەر ئەو هەموۆ کردەوە چاکانەش‌دا، لە ساڵی ۴۰۰ ه ق دا، نێوان ناخۆشیێکی زۆر تاڵ کەوتە نێوان (بەدر)و (هیلالی) کوڕیوە. بە جووریێکی واهاب و کوڕ لە نزیک شاری دینەوەردا بەرەنگاری یەك‌تر بوون. هیلال کە لە لایەن باوکیوە میرایەتی ناوچەی، شارە زووری پێ ئەسپێردرابوو،وە سوپایەکی زۆری لە کوردەکانی ئەو ناوچەیەدە گەڵە خۆی داهێنا بوو، توانی بە فیل‌وتەڵەکەو، درۆ، سەرکردەی سوپایەکانی بەدری باوکی بە بەڵێنی دانی پلەو پایە و ماڵ‌هەڵخەلەتێنێو لە ئاکام‌دا باوکی خۆی یەخسیرکا. بەلاَم باوکی نەکوشت‌و ناردی لە قەلاَیەك لە قەلاَکانی شارە زووردا، خستیّ بەندیخانەوە (رە نگە، قەلاَی زەڵم، بیّ)، بەدریش بە پەنامەکی‌و نهێنی دەگەل (ابوالفتح) کوڕی (عەناز) فەرمانرەوای حەڵوان‌و (ابوعیسیٰ شاذی) دەسەلاَت‌داری (ئەسەدئاوا)دا، لە دژی هیلاڵ دا، رێک، دەکەوێو، بە، نامە یارمەتیان لیّ دەخوازێ. لە ئاکاما، ابوالفتح قرمیسینی (کورمانج‌شای)[2] گرتوو، ابوعیسی‌ش - شاپوور خواست (هەرسین) خستە ژێر دەسەلاَتی خۆیەوە.

بەلام کاتیّ ویستی نەهاوەندیش بگریّ دەروەستی (ابوبەکر کوڕی رافع) دەسنێژی (هیلال) نەهاتولە ئاکام‌دا، گیراو ناردرا لای (هیلال) هیلالیش ابوعیسی‌ی نکوشت‌و کردیّ یەکێك لە راوێژکەرانی نزیکی خۆی.

بەدری باوکی هیلال،کە لەم پیلانەی خۆی هیچ ئاکامیکی وەدەست نەکەوتو بوو، دەستی یارمەتی بۆ لای بهاءالدولەی دەیلەمی درێژ کرد، بهاءالدولەش سوپایەکی قورس‌و گرانی بو سەرکوت‌کردنی‌هیلال‌نارد. هیلال راوێژیکی لە گەڵ ئەوو عیسی دا کە دوژمنی کۆن‌و راوێژی کەری نۆوی بوو، پیکهێنا. ئەبوو عیسی هیلالی لە ئاکامی نالەباری شەر دەگەڵ دەیلەمیکان‌دا، ئاگادار کردو رایگەیاند:

[1] کتێبی کرمانشاهان و کوردستان ص -۱۳۹ -۲۲۲ ۲۲۶ - کتێبی جوغرافیای غەربی ئێران نووسراوەی ژاك دوومورگان وەرگەراوی کاظمی وەدیعی چاپی ۱۳۳۹ تەورێز ص ۲۱۲ - ۲۱۳

[2] کوڕمانجشا، واتە: شاو، گەورەی هۆزی کوڕمانج، شکاك. کاك - شابرا، برای شا:

واباشه سەری فەرمان بە رایەتی، بۆ دەیلەمێکاندا نەوێنی. بە لاْم هیلال بە قسەی نەکردو ئەبوو عیسای کوشت. کاتێ سوپای دەیلەم هێرشیان هێنا سەر هیلال و سوپاکەی ئەویان تەنگە تاو کرد، هیلال پێی لە هەڵە، کەی خۆی ناوداوای لە (فخرالملك) فەرماندەری سوپای دەیلەمی کرد، بۆ ئەوەی لە رێگای هیمنایەتێوە پێك بێن. بە لاْم (فخرالملك) ولاْمی نەداوەو، پرسی بە (بەدری) باوکی هیلال کردو، ئەویش رایگەیاند کە هیلال پیاوێکی فێڵە بازوو گزیکارە باوەری پێی مەکەو ماوەی مەدە. ئەوسا (فخرالملك) بە هەموو هێزو توْاناوە هەڵی کردە سەر هیلالو لە ئاکامی شەرێکی زۆر توندایەخسیری کرد. هیلال داوای لە (فخرالملك) کردنەیدا بە بە دەس بەدری باوکێوە. فخرالملك لە بەرا ئەم داخوْازیەی لێ قەبول کرد بەلاْم پاش گرتنی قەلاْی سۆرماجو تالاْن کردنی مال وخەزینەی ئەو قەلاْیەکە چل هەزار ، بەدرەی دیرهەمو چوْارصەد بەدرەی ئاڵتوونو گەوهەرو شتی زۆری قیمەتی چەكو جووبەخانەو شتومەکی شەرْو، پۆشاکی بە نرخی تێدا بوو (هیلالی) دا بە دەس باوکێوە. بەم جۆرە جارێکی دیکەش (بەدر) دەسەلاْت دارێتی وولاْتە شاخاوییەکانی وەدەس کەوتەوە. وە بە تولەی ئەو ئاکارە نالە بارەی (هیلال) هێنای شارە زووری دا بە (فخرالملك)و هیلالیشیخستە بەندیخانەی (بهاءالدولە) دەیلەمیوە.

لە سالی ۴۰۵ هقدا بە درگەمارۆی قەلاْی کۆس جەدی،داوە حوسێن کوری مەسعوودی کوردی کە یەکێک بوۆە لە کوردە ئازاو ناوبەدرەوەکان، خستە ژێر ئابلۆقەوە بەلاْم بە هۆی هاتنە پیشەوەی زستانێکی تووشو سەخڵت سوپایەکانی (بەدر) نەیان توْانی درێژە بدەن بەم گەمارۆیەو لە ئاکامدا زۆر بە توندی لە بەرانبەر فەرمانی بەدردا جوْابە جەنگیان کردو، خێڵەکانی کوردی جۆزەکان (جەوزەقان – گۆزەکان) هێرشیان بردە سەر خێوەتو بارەگای (بەدر) و کوشتیان. حوسێنی کورْی مەسعوودیش تەرمەکەی، بەدری، ناردە شاری نە جەفو، لە وێ ناشتیان.[1]

---

١ تاریخی جیهان ئارای قازی غەفاری قەزوێنی چاپی سالیْ ١٣۴٣ تاران ١۴٨

دوای کوژرانی بەدر یەکێك لە نەوەکانی بە ناوی ظاهیری کوری هیلال کە لە ترسی باپیرەی (بەدر) لە یەکێك لە هەرێمە شاخاوییەکانی شارە زووردا خۆی شارد بۆوە، بۆوەدەس هینانەوەی گشت ولاتە شاخاوییەکان دەستی دایەشۆرشێکی توند بەلاّم پاش شەرێکی پیاوانە لە بەرابەر. سوپای بێ ئەژماری (شمس‌الدوله)دا تێشکاو پاش ماوەیەك یەخسیر کراو خرابەندیخانەی (هەمەدان)ەوە دوای مردنی بهاءالدوله دەیلەمی (سوڵطان‌الدوله)ی کوریشی، هەروەها هیلالی لە بەندیخانەدا، راگرت.

بەلاّم کاتێ هەواڵی سەرکەوتنە پەیتا پەیتاکانی (شەمس‌الدوله)ی لە ناوچە شاخاوێکانی ولاّتدا، بیست. (هیلالی) لە بەند، بەرەلاّ، کردو، سوپایەکی قورس‌و. بە هێزیشی رەگەڵ خست، بۆئەوەی ناوچە لە دەس چوّەکان، بێنێتەوە، ژێر دەسەلاّتی ئەوانەوە (سولطان‌الدوله)

جا، ئەوە بوو، (هیلال)، لەمانگی ذی‌قەعدەی ساڵی ۴۰۵ هـ ق‌دا، چووە مەیدانی بەربەرەکانی (شەمس‌الدوله)وە بەلاّم ئەم شەڕو، لێکدانە، زۆری نەخایاندو، هیلال، بە خۆیی‌و، سوپایەکەوە، بەرەو شاری (بەغدا) ڕای کردو، پاش ماوەیەکی کەم، گیراو، کوژرا.

لە ساڵی ۴۰۶ی هـ ق دا، (أبوالشوك) کوری موحەمّەدی کورێ (عەناز) فەرمانڕەوای شاری (حەلوان) هێرشی بردە سەر هێندیك لە ناوچە شاخاوێکانی ژێر دەسەلاّتی (شمس‌والدّوله)، ئەمیش لەم هێرشە، دەرفەتی هێناو، ظاهیری کوّری هیلالی، کوری بەدری کوری حەسەنوەی، لە بەندیخانە رەزگار کردو، بە پێی پەیمان نامەیەك، بە سوپایەکی پڕچەك‌و، تەیارەوە، ناردە، بەرەنگاری‌و، بەربەرەکانی (أبوالشوك)ظاهیر، دوای هەڵمەت‌و، هێرشێکی توند، توانی سوپای أبوالشوك، تێك شکێنێو، (سەعید)ی برای ئەوانیش بگرێو، بی‌کوژێ. لە ئاکامی ئەم تێشکانەدا، فەرمانرەوای حەلوان، دەگەڵ (ظاهیر)دا ئاشتی کردو، خوشکەکەی خۆشی دا، بە ظاهیرو، بەم جۆرە بەرواڵەت، خۆی وەکو ژن‌براو، خزمێك لە ظاهیر،وە نزیك خست، بەلاّم لە بنەوە هەر لە دەرفتێك دەگەڕا، تۆڵەی

سەعیدی برای لێ بکاتەوە، ئەوە بو لە ناکاو، هیرشی کردە سەرو، کوشتی.

قاضی ئەحمەدی غەفّاری قەزوێنی لە کتێبی (جهانآرا)دا دەلێ: دوای کوژرانی ظاهیر، بەدری کوڕی ئەم، لە ساڵی ٤٣٨ی هـ ق ش،دا، لە لایەن (ئیبراهیم یەناڵ)وە کرا، بە فەرمانرەوای شاری «قرمیسین»و «دینەوەر» وەك ماموستا ئەمین زەکی بەگ، لە لاپەڕەی ٨٩ی (تاریخ‌الدُوَل والإمارات الکردیه)دا، دەنوسێ: بە کوژرانی ظاهیری کوری هیلال، کتێبی دەسەلاتداریتی زنجیرەی حەسەنوەیهیکانی کورد، تێکەوە پیچراو، کوتایی هات. ڕاستە چەن کەسێکی دیکە. لە سەرەك، هوزە کوردەکانی (بەرزەکانی) پاش حەسەنوەیهەکان حوکومەتیان، پێکەوە نا، بەلام زور، کەم هێزو، کەم خایەن بوون. دواهەمین میری بە ناوبانگی کورد، (دەیسیم کوڕی أبوالغنائم) بوو، کە ناوچەکانی ژێر فەرمانرەوایەتی ئەوانیش، کەوتە، ژێر، دەسەلاتی دەیلەمیکانەوەو، بەم جورە کوتایی بە میرایەتی صەدو، سی ساڵەی (١٣٠) کوردە بەزەکانیکانی هەرێمی سەر بە شارو، ناوچەی (دینەوەر) هاتو، ئەم شارەش لە شکوەو، برەو، کەوتو، تا ئێستاش جێگەی خوی، نە گرتوتەوە.

بەلام (سولطان ئاوای چەمچەمال) کە لە سەردەمی حوکومەتی ئولجایتو ٧١٦ - ٧٠٣ هـ ق )دا، پیان دەگوت (بەغدای چوکە) ببوە ناوەندێکی گەورەی ناوچەی دینەوەرو، جێگەی ئەم شارە مێژوییەو، لە مێژینەی کوردی گرتبوە.[1]

أبوالفرج قُدّامەی کوڕی جەعفەر، نێو دێر، بە (کاتیبی بەغدادی) لە نووسراوەکەی خوی‌دا، بە ناوی (ألخَراجُ وَصنعةُ الکتابة) ص ٦٢،دا، وەهەروەها (ابنُ ألحَوقَل) لە کتێبی (صُورَةُ آلأرض) ص ٣٥٩،دا سەبارەت بە (دینەوەر) دەنووسن ماهُ‌الکوفە،وە، دوشاروڵکەی سەر بەم شارەو، هەمو، ئاوایەکانی ناوچەکەو، تەنانەت ناوچەی «قرمیسین»-کرماجان-کُرماشان،یش دەگرێتەوە.

ماهُ‌لکوفە (دینەوەر) لە روژئاواوە، پاڵوەشاری (حەلوان) دەدا۔ لە باشورە

---

١(تاریخ‌الدّوَل والامارات الکردیه، ئەمین زەگی بەگ ص ٨٩، کرمانشاهان باستان، د - م، گولزاری‌و، حوسین جەلیلی، چاپی تاران ص ١١٧ تا ١٢٠)

(جەنوب) وە شاری (ماسپەذان)دەگرێتەوە. لەلای رۆژهەلاٌتیشەوە، دەگاتە شاری (هەمەذان)و، لە لای باکوریشەوە، خۆی لە ئاذەبایجان (ئاترۆپاتێن) دەدا. داهاتی سالاٌنەی ئەم شارە (دینەوەر) پێنج ملیون دیرهەمە، ماوەلٌی نێوان (هەمەدان)و (دینەوەر) ۳۰ فرسەنگە.

أبوُحنیفەی دینەوەری (ئەحمەدی کوڕی داوودی کوڕی وەنەند) لە کتێبیٚ (أخبارُالطوال)دا، دەلٌیٚ:

دوای ئەوەی (موختاری ثەقەفی) دەستی بەسەر شاری (کوٚفە)دا گرت، عبداللە کوٚری حاریثو، برای ئەشتەری کردە فەرمانڕەوای هەردوو، (ماهان) واتە: ماەالکوفە و ماەالبصرە- (دینەوەرو، نەهاوەند:)و، هەمەدان، هەر لەم سەردەمەدا، کە، موختار، بیوو، بە فەرمان رەوای (دینەوەر) عبداللە کوٚری حوڕی جەعەفی.

بە توٚلەی، مالٌو، سامانە، براوو، کاول کراوەکەی لە شاری (کوٚفە)دا، کە لە لایەن سوپاییەکانی موختارەوە، کەوتبوٚوە بەر، هێرشو، پەلامار، دانەوە، هەلٌی کردە سەر شاری (دینەوەر)و، هەمو سامانو، داهاتی خەلٌکی، بیٚ تاوانی شارو، ناوچەکەی بردو، سوتاند، پاش ئەم کارە نالە بارەو، قەزای دیزە لە گوٚزە خستنەی، بە، هەلٌبەست ملی لە تاریفو، ئازایەتی خوشی ناوەو، بە خوێدا، هەلٌ دەلٌیٚ:

مەقدیسی لە لاپەڕەی ۳۹۵ی کتێبی (أحسَنُ التقاسیم، فی مَعْرِفَةِ الأقالیم) دانراوەی سالٌی ۳۷۵هق )دا، سەبارەت بە، ڕاپەرینە مێژوییەکەی بابەکی (خوڕەم دین) دەنوسیٚ:

کاتیٚ بابەك، لە سەردەمی خەلیفایەتی (مأمون)دا، ڕاپەریو، دەستی کرد، بە شوٚرشو، لایەنگرانێکی زوٚری لە خوٚی خڕ کردەوە، (مەأمون) ترسی ژێ نیشتو، بە سەر کردایەتی عبداللە، کوری طاهیر، کوڕی حوسین، سوپایەکی یەکجا، قورسو،گرانی ناردە سەر (بابەك) خوڕٌەم دین:

عبداللە، لە سەر،ڕێگای (دینەوەر)و، لەم شوێنەدا، کە پێی دەگوتریٚ

(قَصْرُاللّصوُص)- کەنگاوەر- کـەنیكوەر، یـاکـەنیشك ئـاوەر: [1] بـارگەو بـنەی سوپای،دا، بەعەردا (عەرض- زەوی) کـە شـوێنێکی زۆر خـۆش‌و، زەنـوێرو، پڕباغاتە، بەلاّم عەرەبەکان، ناویان نابوو. مەکوۆ، قەلاّی دزەکان: (دینەوەر) واتە ماەُالکوفە:یان، شاری مادی، دراو، بە خەڵکی شاری (کۆفە)

جێگایەکی یەکجار، زور ئاوو، هەواخۆش‌و،، ئاوەدان‌و، سـەر، سـەوزو، بژوێنە. خەڵکەکەی زۆر روو، خـۆش‌و، جـوان‌و، رێك‌و پـێك‌و ، گـەڵەگـەت‌و، بەدیمەنن.

بازارێکی گەلێك گەورەو، بەگەوەڕی تێدا، بنیات نراوە، ئاوی سەر چاوەو، کانێکانی، لە ئەندازە بەدەر، ساردو، سوك‌و، خۆشن. زۆربەی ئاوی چاوگەکان، بە لولەو سەرپۆشی گڵینە، لولەکێشی کراون‌و، جـۆرێك ئـاویان لێ هـەڵ دەقـوڵێ، هەردەڵێی، سرچاوەی خۆ جۆشن باغ‌و، بێستانێکی زۆر جوان‌و، سەر سەوز، لە دەورو بەری ئەم شارەدا، ساز، دراوە. مزگەوتێکی فـەرە گـەورەو، ڕازاوەی تـێدا بنیات نراوە کە تـۆزێك لە بـازارەکـە دورە لە لای سـەروی لای مـینبەرەکـەوە، گونبەذیکی زۆر خاوەن شکۆوی وەك کۆشك، دامەزریندراوە کە من لە تـەمەنی خۆمدا، لەو، مەزگەوتەم، جوانترو، ڕازاوەتر نەدیوە:

(رون کردنە وە یەك):هەروەك لە پێشەوەدا، ڕامان گەیاندو گوتمان، شاری (دینەوەر) هەر لە سەرەتای بەدی هاتنێوەکە دەچێتەوە سەردەمی (ماد)و (هەخامەنیش)و (ساسانی) شارێکی ئاوەدان‌و، خۆش ئاوو، هەواو، زەنوێرو، پڕلەئاپۆرە بووە.

لە سەردەمی ئیسلامە تیشا، تا هێرشی (تەیموری لەنگ) بۆ سـەر نـاوچە شاخاوی و، کوردنیشەکانی ولاّت، بە ناوەندێکی گرینگی نـاوچەی ڕۆژئـاوای

١ ووشەی کەنگاوەر، دەکرێ لە دوبەشی، کـەنیك ئـاوور،ەوە پـێکك هـاتبێ‌و، واتـای کـەنیشکی ئاگربدا،یان لەسێ بەشی، (کەنیك -١-وورەوە بێ، بە لاّم وور، هۆر- خۆر واتابداو (١) نیشانەی و، پاڵ دان بێو، تیکرا، ببیتە گەنیکا خۆر: واتـە، کـچی هەتـاویان وەر، جـێگەبی‌و، واتـای پـەرستگەی کەنیشك‌بێ‌و خوای جوانی‌و، ئاو، مەبەست بێ: واتە ئاناهیتا:

ئیراندا نراوە. لە سەر دمی (ساسانی) دا، وەك سەردەمی (مادە)کان بە شێك بۆوە، لە مادستانی گەورەو، زۆر جاریش هەر بە ناوی (ماد) نێو بردراوە، بە لاَم، هەر لەو ســـردەمە دا، ئـاڵ و، گـۆڕێکی بـەسەردا، هـێندراوەو، دالەکـەی«د» بـەیێ «ی» خوێندراوەتەوەو، بۆتە «مای» هـەروەك ئێستـاش ئـەم «دال» بـە «ی» کـردنە، لە هێندێك ناوچە کوردنیشنە کاندا. هەر لە برەو، نەکەوتۆەو (ئەحمەد) بە (ئەحمێ) و (مەیدان) بە (مایان) دەخوێندرێتەوە، (دێم) بە (یێم) کڕک دەکرێ، پاشان، لە سەردەمی ئیسلامەتیدا، کاتێك، پیتاکو، داهاتی نـاوچەکـە، بـۆخەڵکی (کـوفە) دەبەرچاو. گیرا، ئەم (ییێ)یە،کرا بە (هی-ە)و، (مای) سەردەمی ساسانی بوو، بە (ماە)ی عەرەبی سەردەمی ئیسلامەتی. دیارە (ئەحمەدی کە سرەوی) تەوریزیش لە کتێبی (ئاذری، یا، زەبانی باستانی ئاذەربایجان)دا، سەربارەت بەم (د) بە (ی) کردنە، لە زاراوەکانی (هەمەدان)و، (ئاذەربایجان)دا، دەڵێ:

گەلێك لەم، دالانە (د) بە (ی)گوردراون، وەك (مادان- مایان) وێنەی مایان بلاغ: [1]

## دینەوەر، لە سەردەمی شاکانی (صەفەوی)دا

لە کتیبێ (مێژوی ئولجایتۆ [2] شایەتی (۷۱۶ - ۷۰۳ هق) لە ژێر ڕوداوەکانی ساڵی ۷۱۱ هق دا بەم جۆرە هاتۆوە: شای کۆشكو خانوو، بەرە خۆشەویست، لە (گۆرە پانی شا)دا، لە نزیکەی ناوچەی چەمچەماڵو (کێوی بێستون)دا، شارۆلکەیەکی، گـەلـێک خـاوەن شـکۆی بنیـات، نـاو، نـاویشی، نـا، (سولطـان ئـاوا) حَمدُاللّه موستۆفی قەزوێنیش لە کتێبی (نزهةُ القلُوب) (دانراوی ساڵی ۷۴۰ هـ ق ) لە ژێر

---

١ ئەم مایین یا، (مایان بلاغ)ە یەکێکە لە هەرە کوێستانە سەرسەوەزو، زەنوێرەکانی سەر بە شـاری (سایان قەلا)ی نزێك (تیکان تەپە)ی هەوشار:

٢مێژوی ئوڵجایتۆ- خودابەندە: دانراوی أبوالقاسم عبداللە کوری موحەمّەدی کاشانییە ص ۱۳۲

ووشەی (سوڵتانئاوا)دا، دەڵێ: سوڵتان ئاوای چەمچەماڵ. شارۆڵکەیەکە، لە هەریمێ چوارەم، کە لە داوێنی کۆو، چیای (بیستون)دا، هەڵکەوتۆوە. ئۆڵجایتۆ، کوڕی سوڵتان ئۆرغون خانی مەغوول (واتە خودا بەندە) بنیاتی ناوە.

شارێکی فرە خۆش ئاوو، هەواو، زەنویرو، سەر سەوزە، باغاتو، سەوزاییو، شیناوەردێ زۆرە، داهاتەکەشی، دانەوێڵەو، خەلەو، هەنگورو، شتی بەم جۆرەیە.

حافظ ئەبرۆش لە کتێبی (جامع‌التواریخ رەشیدی) [1]دا، شارولکەی چەمچەماڵ بە جیگەی ناژتنو، بە خاك سپاردنی یەکێك لەکوڕەکانی ئۆڵجایتۆ،دا، دەنیو، دەڵێ، کوڕیکی شا. لەوێ بە خاك سپێراوە.

قاضی ئەحمەد، غەفاری قەزوینی لە لاپەرە ٢٧٨ی کتیبێ (تاریخی جیهانئارا) واتە میژوی گیتی ڕازینەرەوە:دا، دەڵێ: ئەم شارو، ناوچەیە (چەمچەماڵ و، دینەوەر) لە سەردەمی صەفەویکانیشا، هەرخاوەن شکۆو، ئاوەدانو، پڕ، ئاپۆرەو، حەشامات بۆوە.

شاه ئیسماعیلی صەفەوی، لە سەرە بە هاری ساڵی ٩٢٤ هق دا، بۆ.گەشتو. گوذارو، ڕاوو،شکار، هاتە، دەورو، بەری (بیستون،و، چەمچەمالێ، ناوچەی دینەوەر، پاشان لە،ویوە، روی کردە، کویستانە کانی، لای (هەمەدان)و (قوم) چەمچەماڵ ناوچەیەکی پڕ لە داهاتی سەر بە شاری (کرمانجان - خۆرمەشین)ەو، کەوتۆتە لای ڕۆژهەلاتی ئەم شارەوە لای باکورەکەی: حەدّی شمالی، لە دەربەندی تەنگەی دینەوەرەوە، دەس پێ دەکا.

ئەم گەڵی و، دۆڵە، جۆریك هەڵکەوتۆوە کە، بە درێژایی ماوەی فرسەخە، ڕییەك، بە نێوان، چیا بەرزە، بە یەکە وە لکاوەکانی، ناوچەکەدا، تێ پەر دەبیو، سەر ئەنجام. تەنگەو، گەڵی (دینەوەر) بە دی دێنی .

پانو، بەرینی، ئەم گەڵییە، لە هێندێك شوێنا دەگاتە ٥٠٠ گەزو، لە بری

---

١ ص ١٢٠ چاپی تاران سالی ١٣٥٠ بەهوولْ و تیکۆشانی خانبابا بەیاتی

شوێنیشا، دەگاتە ۲۰۰ گەز، بەم گەڵیو، تەنگەیەدا، چەمێك، دێتە خوارەوە، کە ناوچەکانی (کەندوڵە)، دینەوەر،)و، (کولیایی) لە ئاوەکەی کەلك وەردەگرن‌و، کشت و کاڵ‌و، بەرهەمە هاوینی‌و، تاوسانێکانی خۆیانی پێ پاراو، دەکەن.

ئاوایێکانی ناوچەی چەمچەماڵیش، زۆربەی ئاوی ئەم، چەمە بۆ کشت‌و، کاڵ و باغات، دەکار، دێنن، پاشماوەو، زیادێکەشی، لە نزیکەی ئاوایی (بیستون)دا، دەڕژێتە، ناو، چەمی (گاماسب)ەوە

سەنگەری نادرشاه: کاتی نادرشای ئەفشار، (خەڵکی ئاوایی کاڵپۆشی سەر، بە، دەرەگەزی قوچانی لای مەشهەد: (۱۱۶۰ - ۱۱۰۰ ه ق) لە بەرانبەر، هێرشی، تورکەکانی عوثمانی‌دا، خۆی نەگرت‌و، لە شارە زورەوە، گەڕایەوە، لە (نادرئاوای)، چەمچەماڵدا، سەنگەرێکی یەکجار، گەورەو، قایمی، پێک هێنا، کە ئیستاش هەر، بە ناوی نادرشاوە، ماوەتەوە لە سەمەنگانی لای (شاری دینەوەر)دا، قەڵایەکی کۆن‌و، ئاثەواریکی لێ دەبیندرێ، گۆیا. جێگەی بە خێو کردن‌و، بار هێنان‌و، ڕام کردنی، ڕەوە چارەوێکانی (هەجیر) بۆوە کە فیردەوسی لە شانامەکە یدا، باسی کردۆوە.

## دینەوەر، لە سەردەمی سەلجوقی‌و، شاە سولەیمانی ئێوەدا

لە بەرا، پێویستە دیاردەو، ئاماژەیەك بۆ سەرەتای بەدیهاتنی ووشەی (کوردستان)و نوسینی، لە سەر، لاپەڕەی کتێبە میژوییەکان، دا بکەین و، پاشان بچینە سەربارو، دوخی (دینەوەر) لە سەردەمی سەلجوقێەکاندا:

سەرەتای پەیدا بوونی ئەم ووشەیە (کوردستان) کە (دینەوەر)یش یەکێك بۆوە لە هەرێمەکانی سەر بە ئەم ولاتە، بەم‌جۆرە بۆوە: ابن الاثير لە لاپەڕەی ص ۲۳۸ کتێبی الكامل لە ژێر، ڕوداوەکانی ساڵی ۴۹۵ ه ق دا، دەنوسێ: لە سەردەمی

خەلافەتی (ألناصری عەباسی)دا، شەڕو، کێشەیەکی یەکجار، توندو، دژوار، کەوتە نێوآن (عمادُالدِّین زەنگی) فەرمان ڕەوای ناو، داری ئاتابەکانی تورکو، کوردە (مەڕوانیێکانەوە) بلێسەی ئاگری ئەم شەڕوپێکدا، دانە، گەییشتە، ولاٚتی شام، دیاربەکر، موصلٚ،جزیرو، بۆتان، شارە زور، ئەخلاٚطو، ئاذەربایجان (ئاترۆپادگان)ەوە.

بەلاٚم، دوای دوسال، پێکدادانو، لێك دان، ئاوی ئاشتیو دوستایەتیان، بە سەر ئەم، ئاگرە،دا کردو، کوژاندیانەوەو، هەدوك لاٚ (کوردو تورك) بە یەکەوە هەلٚیان کردە، ولاٚتی ئەرمەنستان، ئاسیای گچکە، بین‌النهرین، و شامو، ضەرەدو، زیانیکی فەرەیان، بە ئەرمەنیو، خاچ پەرستەکان گەیاند، دیارە ئەم یەکیٚتیو، ئاشت بونەوەش، زۆری نەخایاندو، بەر کە سەر، نە بوو، ودیسانەوە، کوردە مەروانیێکان، دەگژ تورکەکان هەلٚ چونەوە، بە لاٚم دەتوانین ئاماژە بۆ بەرهەمێکی هەرە گرینگی ئەم رێککەوتنو، یەک بوونەی کوردو تورك، لە کوتایی چەرخی پێنجەم و ، سە رە تای چەرخی شەشەما، بکەین، کە ئەویش، بە دیهاتنی ووشەی (کوردستان)و، دابڕینی، ئەم ناوەیە، بە سەر، ناوچە کورد نیشنەکانی روژئاوای، ولاٚتی (ئێران)دا. چونکو، سولطان سەنجەری سەلجووقی، هاتە سەر ئەم، بیرو، باوەڕە، کە پێویستە، هەمو، ناوچە شاخاوییەکان. بدا، بە، برازاکەی خۆی، واتە: (سولٚطانشا) و لە سەرەتای چەرخی شەشەما، بەشی رۆژئاوای، ولاٚتە شاخاوییەکان لە ولاٚتی بەر، بلاٚوی ئێران، جیا، کاتەوەو، ناوی (کوردستانی) بە سەردا، بێریٚ،

هەروەك من خوٚم (موحەمّەد پور، داشبەندی) لە کتێبی (ئاداب‌و، ڕسومی کوردان)دا، دەربارەی ئەم مەبەستە لیٚ توٚژیومەوە، ڕاٚم گەیاندوٚوە کە، بۆ یەکەمین، را، ووشەی (کوردستان) لە لایەن، حمدٚالله موستۆفی قەزوێنی یەوە، کەوتەسەر، روپەڕەی مێژوو، لە لاپەڕەی ١٠٧ی کتیبیٚ (نزهةالقلوب) دانراوی سالٚی ٧٤٠هـ‌ق‌دا جێگەی بوٚ هەتا هەتایە، بوٚ تەرخان کرا. دیارە ناوەندی ئەم شازدە هەرێم‌و، شارەی لە ژێری ناوی کوردستان،دا، فەرمانڕەوایتیان بە سەر،دا، دەکرا،

شاری وەهار (بەهار)ی سەر بە شاری (هەمەدانی) ئەمڕۆ بوەوە، بە ناوی (دارالملك) كورسیو، پیتەختی میرایەتی: سولەیمان شای ئیوە) نیو، دێر ببوو. موستوفی ڕونی كردوتەوە، كە لەو سەردەمەدا (سەدەی شەش و، حەوت و هەشت) هق هەریمی كوردستان، سەرەڕای ناوچە كوردنشینەكانی ردوژئاوای ولاتی ئەمڕوی ئیران.

شارەكانی (ئالیشتەر)ی لورستانی ئەمڕوی ناوچەی حەسەنوەند، ٥٤ كیلومیتری خورەمئاوا (خرّمآباد) شارە ژور،یان، شارە زور: سولەیمانی كوردستانی ئەم دیو (عیراق)و، شاری (دیاربەكری) كوردستانی توركیاشی، گرتوتەوە. تا سالی ٦٥٥ هق ) شاری وەهار (بەهار) كە ناوەندی فەرمانڕەوایەتی كوردستان بوو، هەروەها، لە گەشە كردنو، گەورەوە بووندا، بوو، تائەوەی لەم سالەدا، كەوتەدەس ئەمیر چوپانی مەغولیوەو، پاش سوتاندنو، خەلك (كورد) لی لانەوازو، پەرەوازە كردنو، مەغول لی نیشتە جی كردن، ئیتر هەر، نەیتوانی، شكو، ئاوەدانی خوی وە دەس خاتەوە. تا گەییشتە سەردەمی ئولجایتو. كوری ئورغون خانی مەغولی، كە لە چەمچەمالی لای بیستون، دا شاری سولطانئاوا (خودابەندە)ی بنیات ناو، ئەمی لە جیگەی (بەهار)دا، داناو، بەهاری بە تەواوەتی لە شكو، گەشە كردن خست:

میستر لوسترانج: دەلی: لە سەرەتای چەرخی شەشەمی هقدا. سولطانی سەلجوقی ولاتە شاخاویكانی لە كرمانشا (خورمەشین) جیا كردەوەو، ناوی كوردستانی لی ناوو،دای بە براز كەی خوی بە ناوی سولەیمان شاو، شاری (بەهار) كە لە ١٢ كیلومیتری شاری هەمەدان دایە، كردەناوەندی فەرمان ڕەوایەتی كوردستان، كە لە چەرخی حەوتەما، بووە خاوەنی ١٦ هەرێم.

مینورسكی زانای بە ناوبانگی روسیش لەم بارەیەوە، دەنوسی: لە چەرخی دوازدەهەمی زایەنی و شەشەمی كوچی مانگیدا، سولطان سەنجەری سەلجوقی، چەن ناوچە و هەرێم كە زنجیرە چیاكانی (زاگروس) كەو تبوە، نیوانیانەوە، بە ناوی (كوردستان) لە ولاتی بەر بلاوی ئیران جیا كردەوە، كە بە شی لای

رۆژهەڵاتی ئەم وڵاتە (کوردستان) شاری هەمەدان، دینەوەر، کرماشان، و بەشی لای روژئاواشی وڵاتی شارە زور،و، سەنجار (شەنگار)ی دەگرتەوە، لای باشوریشی تا ئالیشتەری، خورّەم ئاوا،و، لای باکوریشی، ئاذربایجان (ئاترۆ، پایگانی) دەگرتە بەر، بە لاّم پیّگەی فەرمان رّەوایەتی هەمو، ناوچەکانی کوردستان، لەو سەردەمەدا، شارو، قەلاّی (بەهار)ی لای شاری (هەمەدان) بوو، کە سەر جەم ١٨ شارو، هەریمی لە ژیّر فەرمان،دا بوۆە، دیارە ئەو شارە دوای هیرش‌و مەردنی (چەنگیزخانی مەغول) نەیتوانی شکۆو،گەورەیی خۆی وەدەس خاتەوە.

لە چەرخی پازدەی(١٥) زاینیدا، تورکەکانی عوثمانیش ناوی کوردستانیان، بە سەر، ولاّت‌و، ناوچەکانی (درسیم) دیار بەکر، و، موش،دا دا،بڕی. بەلاّم لە سەردەمی (کەمال ئاتاتورکا) ناوی کوردستانیان، لە سەر هەمو ناوچەو، شارە کوردنشینەکاندا، کە، لە سەردەمی (سولطان سەلیم‌خان) دا ١٨: ئوستان‌و پاریزگایان هەبوۆە سڕیوەو، بە توندی پیّیان لەسەرنە بونی نەژادو، تۆرەمەی کورد، لە ولاتی (تورکیا)دا، داگرت.

بە وەشەوە نەویّستان، تا ئەو جیّگایەی بۆیان لووا، هەرماڵە کوردیّکیان لە نیّو، چەن ماڵ تورك دەخزاند، بۆئەوەی بە تەواوی ووشەی کورد، لە ناو بەرن‌و بیان تویّننەوە.[1]

هەروەك رّامان گەیاند، شاری دیّنەوەر، هەریّمی چەمچەماڵ لە سەردەمی میّرایەتی سەلجوّقییّەکاندا، گەلیّك ئاوەدان‌و، سەرسەوزو، بەرّمین بووّە، خەلّکەکەش لەو پەرّی خوّشی‌و، پوّشتەیی‌و، کەیف‌و، دەماخ،دا بوون، کە حافظ حوسین تەوریّزی ناودیّر بە کوّری کەربەلایی، لە کتیّبی رَوضاتُ الجِنان و جَنّاتُ الجَنان) دا، دەلّیّ: کاتیّ سولطان مەلیك شای سەلجوقی، شاری (دارُالسلام: بەغدا)ی گرت‌و ، تیّدا، سەقامگیر بوو، ویستی یەکیّك لەم کەنیزانەی بارەگای

---

١ ص ٦٩ کتیّبی ئاداب و رسومی کوردان: عەزیز موحەمّەدپور داشبەندی:

خەلافەتی بەغدا، کە هێشتا، تیشکی هەتاو، لە ژێر چارشێوی رەشیشا، گوناو، روخسارو، دیمی ئەوی بە تیری ڕوناکی خۆی نەپێکابوو، بخوازێو، بهێنێتە ژێر، کەمەندی ژنو، مێردایەتیوە، بە (خواجە نظامُ‌الملك)دا، ڕای سپارد، زۆر، بە پەلەو، لەز، بڕواتە شاری (ئیصفەهان)و، لە ماوەی دوحەوتەدا، دوصەد هەزار، دیرهەم کۆکاتەوەو، بێ هێنێ بۆ خەرجی ئەو زەماوەندوو، شاییە.

خواجەش لە سەر ئەم فەرمانە، لە ڕێگەی شاری (دینەوەرەوە) بە رەو (ئیصفەهان) دەکەوێتە ڕێ بە هەڵکەوت لە ناوچەی دینەوەرا، دەبێتە میوانی، میوانگرو، کەڵە پیاوێکی، یەکێك، لە ئاواییەکان، دیارە ئەم پیاوە کوردە، بە پێی دابو، نرێتی لە مێژینەی گەلی کورد، ئەوەی لە ووزەو، توانایا، دەبێ دەربارەی ڕێزو، بەگەورەگرتنی (خواجە نیظامالملك)دا، بە جێ دێنێ، پاشان، بە ڕاشکاوی لێی دەپرسێ، چۆنە، خواجەهە، وا، بە پەلە، دەگەوێتەوە بۆ (ئیصفەهان)؟

خواجەش لە وولاما، دەڵێ: کارێکی زۆر پێویست بۆسولطان هاتۆتە، بەرەوەو، نیازی بە دوصەد هەزار دیرهەم هەیە، کابرای خانە خوێی وەزیر، دەڵێ: گەورەم من دەتوانم تەنانەت چوارصەد هەزار دیرهەمیش بدەمە خزمەتتان، بەلام، بە مەرجێك، ئەویش ئەمەیە، من پیاوێکی پیرو، زۆرهانمو، نێرینەش تەنیا ئەو کوڕەم هەیە، ئەگەر، بیڵن بچێتە خوێندنگەی خەطو، بە سەرا، گەییشتنی سامانو، پیتاکی خەڵك لە لایەن میریوە، چونکو تا ئیستا بە پێی یاساو، زاکونی میری، ئێمەی وەرزێرو، پاڵەو، سەپان، لە خوێندن، بێ بەری بوین، خواجە نیظامیش، دەس بە جێ چەپەرێك، بە رەو، (بەغدا) دەخاتە رێو، شای سەلجوقی لەم مەبەستو، کارەساتە تێ دەگەیەنێ، شای سەلجوقی کاتێ چاوی بە دەسنوکەی جواجە دەکەوێ، زۆر، توڕە دەبێو، لە بەر خۆیەوە، دەپڕمێنێو، دەڵێ: ئەگەر، ئەمەگی ئەم چەندساڵ خزمەتە، کە خواجە، لە پێناوی منو، باوکم،دا، کردویەتی، نەبوایە، بەلایەکم بە سەرا، دێنا، ئەوپەری دیار نەبوایە، خواجە نازانی من نیازێکم بە سامانو، ماڵی وەرزێرو، خەڵك نی یە: چۆن دەکرێ من کوڕە وەرزێرێك بنێمە بەر خوێندنو، پاشان کاری میرایەتی خەڵکی پێ بسپێرم ئەوسا کە، کارێکی

نالەبارو، ناحەزی لیّ رو، بداو، خەڵکی خاوەن ئیمان بکەونە، سەر کۆنە کردنی منو، بیژن، برۆا، مەلیّك شا، بۆ، پولو، پارەو، دراو، زانستو، خویندن کە هەر هی خاوەن رەسەنو، بنە ماڵە ناو، دارەکانە، و تایەبەتی ئەوکەسانەیە، لایەنگرو، کار بە دەستی میرین، دایە دەس کوری ئەم بنە ماڵە بیّ ناوو، نیشانانە [1] بـۆ خـواجـەی نووسیۆە، مەویستەو، بەرەو، ئیصفەهـان بکـەوەریّ یـاقوتی حـەمەوی لە کـتیبی (مُعجَمُ‌اَلبَلْدان) دانراوی ساڵی ٦٢٣ ه-.ق،دا، لە ژیر ووشەی (دینەوەرا) دەنووسیّ:

دینەوەر، یەکیکە لە شارەکانی هەریمی سەر بە ولاتە شاخاویکانو،کەوتۆتە نزیك شاری (قرمیسین - خۆرمەشین) واتە:کرماشان - کورماجان)ی ئەمرۆوە.

گەلیّك مـروی هـەڵ کـەوتوو، نـاوداری تـیدا هـەلکەوتووە، کـە هـەر بـە (دینەوەری) ناسراون، دیارە ئیمە (محمّەدپور) لە لاپەرەکانی داهاتودا، بـاسی ئەو، ناودارە کوردانەش دەکەینو، ناویان دەخەینەروو:

ماوەڵی (دینەوەر)و، (هەمەدان) ٢٥ فرسەخە، تا شارە ژور،یان شارە زور، ٤ قۆناغە، پانو، بەرینی ئەم شارە سییەکی شاری هەمەدانە ($\frac{1}{3}$) بەلاّم خەڵکەکەی لەباری خۆشروویی‌و، میوانداری‌و، دەستو، دڵ، والاّیی‌و، زانستو، پـیشەوە، گەلیّك لە خەڵکی (هەمەدان) لە پیش‌ترن، هەڵبەت کوری حەوقەلیش (ابنُ‌الحوقل) بەر، لە حەمەوی واتە لە چەرخی چوارەما، هەرئەم بیرو، رایەی دەربریوەو، دەڵیّ، دانیشتوانی (دینەوەر) فرەفرە لە دانشتوانی (هەمەدان) زاناترو، بـاشترن: دیـارە هیندیّك لە گەروّكو، ولاّت ناسو جوگرافیا زانـەکـانی ئـەو سـەردەمە، مـاوەڵی دینەوەرو، هەمدانیان بە ٣٠ فرسەخ، داناوە، نەك ٢٥:

١ دیارە، دوکتور حەسەن صەدر، بە لاغی، لە کتیبیّ «حقوق زەن دەر ئیسلام»دا، ئەم مەبەستەی (کە خویندن تایەبەتی‌دەرباریانو، کار بە دەستەکانی نزیك شابووە)داوەتە پاڵ ئەنوشیروانی عادلی‌ساسانیوە:

# کوردو کورمانج

ڕاسته ئەمڕۆ، له سەرتاسەری ناوچەو، هەرێمو، شارە کورد، نشینه کـانی، ئێران، تورکیا، عێراق، سوریا، ئێرەوان، تفلیس،و جێگه کانی تر،دا که به کۆمەڵ،یان تاك،و، پرژو، بلاوی، کوردیان، تێدا، دەژی، ئەم دو، ووشەیه (کوردو، کورمانج) یەك واتا، دەدەن،و، به زاراوەی زانستی، پێیان دەگوترێ هاو،واتا) مترادف: واته: کاتێ دەگوترێ کورد، هەرکورمانجەو، کـاتێکیش، کورمـانج دەگـوترێ،یـان دەنووسرێ، هەرمەبەست کوردە، هەڵبەت له زۆر شوێنا، پتر، ووشەی (کورد) بۆته باو، وەك ولاتی ئێران،و، عێراق،و ، ئێرەوان،و له هێندێك ولاتی وەکو تورکیاش،دا ووشەی (کورماج)یان کورمانج بۆته باوو، تەنانەت له هۆنراوو نوسراوەی گەلێك له زاناو، پسپۆڕو، بلیمەتەکانی ئاییینیشا، وەك مەلای جـزیری، فـەقێی طـەیران، مەلای باتی، عەلی تەڕموکی، ئەحمەدخانی،و، هیکەش، پتر (کورمانج)دە کەوێته بەر چاو، تا ووشەی (کورد)

ڕەنگه هۆی سەرەکی ئەمەش که دیارە له دوای له دوای ئاییینی پیرۆزی ئیسلامەوە، زیاتر پەرەی ساندۆ، ئەم هەمۆووە نێوە نت کەو، درۆودەلەسه ناحەزو، ناخۆشه بێ که له لایەن نەیارو، ناحەزەکانی گەلی کوردی ئـاری نـەژادەوە، بۆیـان هـەڵ بەستراوەو، تەنانەت خراونەته، نێو کتێب،و، نووسراوه ئـاییێنێکانیشەوەو، بـۆنەته قوڵه چۆماغی سەرکوت کردن،و، پێشێل کردنی مافی ڕەواو، خودایی ئەم گەلە، له درێژایی مێژوی پڕ له شانازی،و، خۆبه خت کردنیان،دا، ئەمە، تا دەگاته سەردەمی

فەرمان ڕەوایەتی کەمال پاشا واتە: (ئاتاتورك) ئاشکرایە، دوای دەکارهێنانی فێڵو، تەڵەکەی تایەبەتی خۆیی‌و، گرتن‌و، لەسێ دارەدانی دەیان ڕابەری دینی وەك شیخ سەعیدی پیران، و شیخ، عبدالقادر شەمزینی،و، کورە هەڵکەوتۆکەی‌و، دوکتور فوئادوهیکەش، وە هەروەها قەلاچۆکردنی خەڵکە بێ تاوانەکانی ئەم گەلە، لە گشت شارو، شارۆڵکەو، گوندیکی کوردەواری‌دا، کە بە ڕاستی مێژو، لە گێرانەوەی سەری شەرمەزاری، دا، دەنوێنێو، دەمی لە گۆدەکەوێ و، پەنجەی نووسینی ووشك دەبێ،کە چۆن ئەم هەموّە ژن و منداڵو، پیرو، زۆرهانەیان بەو، زستانە توش و سەخڵەتە، لە چیاکانی ئاڕراتو، ئاگری داغ دەپەستاوت‌و،لەئەشکەوتەکانیشا ئاگرو، قانگیان دەدان [1] دوای ئەوە بە پێی یاسای کاتی، بە سەرزاردا، هێنان‌و نووسینی ووشەی (کورد) قەدەغەکراو، بە سوچو، تاوانێکی زۆر دەژمێردرا،

دیارە ئەم تاوانە تا ماوەی سالێك لەمەو، بەر، لە لایەن میریی ئەو ولاتەوە هەر بەرێوە، دەچوو، دەیان کەس، لە خوێندکارو، مامۆستاو، زانایەکانیان بەم تاوانە گەورەیە، کە دەیان گوت (من کوردم)یان (تۆ کوردی)یان (فلانەکەس کورد، بۆوە)؟؟ لە بەندیخانە پڕ لە ئەشکەنجەکانی ولات توند، دەکرد.!؟

جا، بەم هۆیەوە،کوردەکانی ئەو، ولاتە لە لایەکەوە نەیان ویستووە، بکەونە، بەر تیری ئەم گشتە، تەوس‌و، توانج‌و، نێوەنتکەیەی کەبو (کورد)دا،نراوە، لەم لایەشەوە، گوتنەکەشی، کەدەبۆوە باری سەرباری هەموّە دەردەکانی تری نەتەوەیی کورد، و بەم تیرە ژاراوییە لە جوم و جوڵ خرێن.

لە ئاکاما، هاتنەوەسەر ئەم ووشە ڕە سەنە (کورماج) کە کورد بەر، لە تێك هەڵچوون و شەڕو، بەربەرەکانێەی، ئاشۆرو، کەلدەو، ئارامی‌و، ئەرمەنی‌دا، کردویانەو، هەرکام لەم هۆزانە، ناوێکی پڕ لە ئازایەتی‌و، بوێریان، بۆگەلی (ماد)ی باپیرە گەورەی ئێمە، داناوەو، بەم بۆنەوە، لە شەرەکانیاندا، پترباسی ئازایەتی خۆشیان کردوەو، ڕایان گەیاندوەوە، کە چۆن ئەم هۆزە ئازاو، دلێرەیان، لە بەرەکانی

---

[1] دیارە، کورد، زۆرجار، تووشی ئەم بەلایە بۆوە، کە کوشت‌و، برەکانی بەعیش هەر نمویە کە لەم هێرشە دڕندایە، بەلام ، کورد هەرخۆی گرتووەو،تا ئەمڕۆش، هەر ماوەتەوەو، هەر دەشمێنێتەوە

شەڕدا، تێك شكاندوّوە. ئەمە كەگوتمان (كوڕمانج) بەر لە ووشەی (كورد) بوّوە، بەم، بەڵگانەی خوارەوە یە: ڕاستە زانای بیلمەتی روس ـ مینوّروسكی، دەربارەی ووشەی (كوڕمانج)ەوە، دەنوسیّ:

ئەم ووشەیە، لە سیّ بەش (١)كوڕ، كورت كراوەوەی «كورد» (٢)مان، كورت كراوەوەی (مانایی) (٣) ج، پاشگری وەپاڵ دان (نیسبەت) پیّك هاتوّوەو، ووشەكە (كورمانج)داگری ناوی دو هوّزی گەورەی (كورد)و (مانایی)یەو، ئەمەش دوای شەڕو، پیّكدا، دانیكی چەن ساڵە، لە نیّوان، ئەم دو،گەلەدا، كە پاشان بونە هاواڵو، دراوسیّ یەكتر، پیّك هیّندراوە،و، ووشەكە بوّتە ناوی ئەو، دونەتەوەیە،[١] بەلاّم كاتیّ ئیّمە دەڕوانینە، باری بیرو، ڕای ئایینی گەلی (ماد) تەنانەت بەر لەوەی، فەرمان ڕەوایەتیّكیّ هاو بەش و، بەڕاو، تەگبیری (حوكومەتی شوڕایی) پیّك، بێنن، سوروشت پەرست بوونو، مانگ و ڕوّژ (میهر ـ میر - شیدا، و مانگو، مانژو، مانج)یان، دەپەرستو، (بە پیّچەوانەی سامی نەژادەكان، كە بوتو، خودای دەستكردی خوّیان دەپەرست)

خوّیان بە كوڕو، نەوەو، نەتیژەو، خوڵقاوی مانگو، ڕوّژ (ڕوّش ـ روچ و ڕوّز)دا، دەناو، شانازیان پیّوە دەكرد، تەنانەت كاتیّ زەردوشت (زەردووشتر) پەیام هیّنەری خوایی، بوّنەتەوەكەی خوّی، واتە: (ماد) كە كتیّبی ئاویّستاش هەر بەم زمانە بوّوە: چونكو حەق تەعالیٰ، لە قوڕئانی پیروّزا دەفەرموّی [وما أرسلنا مِن رَّسُولٍ اِلاّ بِلسانِ قَومە[٢]]ئایەتی واتە: هەمو پەیامبەرەكانمان، بوّسەر هوّزەكانیان، هەر بە زمانی ئەوان ناردووە. دیسانەوە، دەگەڵ ئەوە شائایینەكەیان وەرگرتبوو،

ئوّگریو، ئەوینی مانگ و، ڕوّژ پەرستیان، لە ژێر، سیّبەری ئەم ئایینەدا، بە ناوی زوّر، وانی و شیدو، میترا، دا، دەنواندو، دەپاراست. تەنانەت ناوی (كوّروش) سەر ئاڵتەی زنجیرەی شاكانی هەخامەنیش،كە دایكی ناوی (ماندانا)

١ هەلبەت ماناییّ یەكان، لە دەورو، بەری زریّباری «چی چیست» واتە: وورمیّی ئەمڕوّدا، بوون:
٢ ئایەتی ٤ سورەی ئیبراهیم: تەواوەكەی [لِیُبَیِّنَ لَهُم، فَیُضِلُّ اللهُ مَن یَشاءُ، وَیَهدی مَن یَشاءُ وَ هُوَ العَزیزُالحکیمُ: ]

و، ماد، بۆوەو، ئەم ناوە لە لایەن شوانێکی باوکی (ماندانا)وە، لەو، نراوە، مادیو، کوردی،یە کە من (محمّەدپور، داشبەندی) ئەم باسەم لە لاپەرەی ۲۲۵ی کتێبی (ئاداب و، ڕسومی کوردان) چاپی ساڵی ۱۳۷۰کۆچی هەتاویدا. هێناوەو، ئەمەش کورتەی ئەم نووسراوەیە:

کاتێ، هارپاکی وەزیری شای «ماد» ئەم منداڵە تازە لە دایك بووی «کوروش» لە لایەن شاوە، پێ سپێرا، بۆئەوەی زیندە بە گۆری کا،یان بی کوژی، ئەمیش بە دو، هۆ، خۆی لە، لە ناوبردنی ئەو مناڵە بێ تاوانە بوارد، یەکەم: دەیەویست ڕای گری و،گەورەی کاو. تولەی کوڕەکەی خۆی کە بە دەس شا،کوژرا بوو، گوشتەکەشی بە، برژاوی دەرخواردی ئەوان (وەزیر) درابوو، بکاتەوە، کە تولەشی هەر، بە کوروش لێ سەندەوە.

دوهەم: گەرێکی نەبوو مناڵێکی بێ تاوان، لە خۆڕاو، بە بونەی خەوێکی بیندراوی شا، کە هەمو مناڵەکانی ئەو ساڵەیان، لە ناو، برد، لە نێوبچێ، ئەوە بوو، ئەم مناڵەی دا، دەس شوانێك‌لە شوانەکانی شاو، پێی ووت گەورەی کە، بەلاّم کەس بەم کارە ساتە نەزانێ. شوانەش بە خۆشحاڵیوە. کوڕەکەی بردەوەماڵ. ژنکەی کاتێ دیتی، وا، شۆکەی کورپەیەکی بە باوەشەوەیە، بە سەرسامیو، بێ باوەڕییەوە، گوتی؛ ئەم مناڵەت لە کوێ هێناوە،؟! (ئەوە شمان لە بیر نەچێ،کە ژنی شوانە، تازە مناڵی لە دەس دابوو، هێشتا مەمکەکانی پڕ بوون لە شیر) ووتی: خوا، پیێی داوم (کۆر، روشە) کوڕی، ڕۆژە، پاشان، ووشەکە سوواو، بووە (کوروش- کورش، کوڕ،رەش) دیارە ئێستاش ئەم ناوە (کوڕ،ڕەش) لە کوردەواری‌دا، بۆ مرۆو، پیاوی ئازاو، دلێر، دەکار، دەکرێ: و: (سیفُ‌القضاتِ قاضی) هونەری ناوداری کورد، لە هەڵبەستێکا ناوی کوڕی رەش دەباو، دەڵێ:

کورد، نابێ بترسێ لە زیندانو، داروچێو- بۆرۆژی هەرایە، کوری ڕەش، کچی دزێو-

ئاشکرایە ئەم ناوە و (کوڕمانج)و، خۆبەکوڕی مانگ و هەیڤ زایننە، هەر بە ماوەی بەر لە ئاینی زەردەشت‌و، سە ر دەمی ئەوانەوە، نەبەستراوەتەوە بەلکوّ ئەو

قۆناغانەی بڕیوەو، تە نانەت خۆی گەیاندۆتە، ناوەندی سەر دەمی ئیسلامەتیو
لەو ساوە تا ئەمڕۆش هەر خۆی پارازتووەو، ئێستاش هۆزێکی گەورەو، ئازاو،
دلێری کورد، کە بە دەیان پیاوی گەورەو، زاناو، لێ هاتووی وەك هەمزەئاغا) و
(مەلا خەلیلی گۆرئۆمر) یان لێ هەڵکەوتووە هەر ناوی کوڕی مانگ واتە
(مەنگوڕ) مانگ کوڕ، ماوەتەوە، بەم پێیە دەتوانین بێژین، ناوی (کوڕماج)یان
کورمانج، کوڕماژ مانگ کوڕ، هەر لەو ساوە، کە نەتەوەی (ماد) خوای ناسیوەو،
مانگو، رۆژی پەرستوە، شان بە شانی ئەم نەتەیەوە، هاتووەو، لە هیچ قۆناغێك،
لە قۆناغەکانی ژیانی دا، لێی هەل نەبڕاوەە ڕەنگە هۆی هەڵ بژاردنی (مانگ)و خۆ
بە کوڕ زانینی ئەمیش زیاتر بە هۆی جوانیو، بە چەن چەشنە خۆ دەرخستنی
مانگو، جارجارە شاردنەوەی و، خۆ لەبەر چاو، بزر، کردنی ئەو بێو،
ئاماژەیەکیش بۆ جوانیو، ڕێکی و پێکی خۆیانو، دەر بڕینی ئەم واتایە، کە ئێمەی
(ماد) کوڕی ئەو مانگە جوانەین، جا بەم هۆیەوە نەیان گوتووە ئێمە کوڕی رۆژین:

## سەرەتای بە دیهاتنی ووشەی (کورد)

هەروەك زانای بەناوبانگی ئێران حوسین پیرنیا، واتە موشیرالدّولە: لە کتێبی
(ئێرانی قەدیم)دا لە زمان (ئۆسترابۆن)ی یۆنانیوە دەگێڕێتەوە، کە مادەکان
تاقمێکی بە شانو باهۆیان ، لە، لاوەکانی کوڕ، دەناردە نێو لێڕەوارو، چیاو،
ئەشکەوتەکانی، ولاتەوە بۆ ئەوەی بتوانن، لە کاتی خۆیا لە بەرانبەر، سەرماو،
سەخڵەتی و، توشیدا، خۆ ڕاگرو، ئازاو، نەبەز، بن، دیارە ئەم تاقمەلاوە (مادە)
پتر، لە میوەو،دانەوێڵەی خود،ڕوو،خۆرسکی لێڕە وارەکانی ولات، کەلکیان،
وەردەگرت، کە بە مانەیان دەگوت کوردۆ- Corduo: واتە ئازاو، دلێرو، جەنگی:[1]
لە، تەتەڵەو، بەردو، خشتە نوسراوەکانی پادشاکانی (ئاشوری)ش داهاوی

---

1 لاپەڕەی ٧٩ کتێبی ئادابی و، ڕسومی کوردان، نووسراوەی عەزیز موحەمەدپور، داشبەندی
چاپی تاران سالی ١٣٧٠ کوچی هەتاوی

ئەم نەتەوەیە (ماد) لە ژێر، سەردێری (کاردو)دا، لە گەلێك شوێن‌دا، وە بەر چاوە دەکەوێ.

دیارە ئەم ووشەیەش بەزاراوەی ئاشوری، هەر بە واتای ئازاو، نەبەزو، شەڕ کەرو، بوێرە. چونکو، کاتێ ئاشورەکان، لە گەڵ مادەکانا، دەکەوتنە شەڕو ، لێك، دانو، پێکدا دانو، زۆر جار، مادەکانیان، دەشکاندو، ماڵو، تالآن و سامانی ئەمانیان، دەگەڵ خۆیان،دا، دەبردە بە شانازیو، خۆ هەڵکێشانو، فرو، فیشالێکی زۆرەوە، باسی ئازایەتی ئەمانو، سەرکەوتنی خۆیان دەگێرایەوەو، دەیان هێنا، ئەم کارە ساتانەیان، لە سەر، تەتەڵە گلینەکانی خۆیان،دا دەنووسیو، ناوی ئەم هۆزەشیان (ماد) بە (کاردو) دەبرد، کە بە واتای شەڕکەرو، ئازایە:

یەکیك لە م تەتەلآنە، نووسراوەکانی سەردەمی (سەرجوین) پادشای ئاشورە، کە بە خەطی بزماری ئاشوری نووسراوەو، ووشەی (کوردۆ،کاردۆ)ی بە واتای ئازاو، بوێرو، نەترس، تێدا هاتوە

[گوردو،کورد] دوریش نییە ووشەی (گورد) کە بە واتای پاڵەوانو، ئازایە، هەرلەووشەی(کوردۆ)وە هاتبێ چونکو بنە مای پەیدا بوونی هەرکیان هەریەکەو، یەك واتا دەدەن، بەلآم بۆ شوێنە وونکێو، بە خەیاڵ لێك، جیاکردنەوەی (کورد)و، (گورد) لە شانامەی (فیردەوسی طوسی)دا،

هەر (گورد) هێنراوەو، بە تیتوش لە نووسراوە چاپ کراوەکانی ئەم شانامە بە نرخەدا، ناوی (کورد) نابینرێ و، بە تەواوەتی شێردراوەتەو، وەلاخراوە، و، زۆرکەسیش هەرپییێ نەزانیوە، بەلآم ئەوانەی ئاگاداری مێژون دەزانن هۆی ئەم گۆرانکاری و، گزیکاریانە چی بوونو، چین،بێ گومان یەکێك لەم زانا بە هەستانە، خوالێ خۆشبوو، (حاجی قادر کۆیی) یە،کە بە زمانێکی ڕاشکاو، پاراو، ئەم ڕاستە قانێیە، دەردە بڕیو، دەڵێ :

(گوردی) شانامە پاکی هەر (کوردە) کافی ئەم صافەو، کاڤی ئەو، دوردە [1]

---

١ پێشەکێکی هەژارانە: سەرەتای کتێبی ئاداب و، رسومی کوردان. لە (عەزیز موحەمەد پور داشبەندی) وە هەروەها، لاپەڕەی ٧٨ی ئەم کتێبە:

هەڵبەت (مەسعودی) ش لە کتێبی (التنبیهو، الاشراف)دا (کورد) بە کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی مەنوچیهر دادەنێو، هەورامانێکانی خۆشمان، خۆیان بە کوڕی بە همەنی کوڕی ئەسفەندیار، دەژمێرن.[1]

## کتێبی دانیشی بەشر

لە لاپەڕەی ۷۱۷ی ئەم کتێبەدا، کە یونیسکۆ، چاپی کردوە، لە ژێر بابەتی مێژوی ئێرانی بەر لە (ماد)دا، هاتوە:

گۆتیان، بەم هۆزانە گوتراون کە لە هەزارەکانی دوهەمو، سێهەمی بەر، لە عیسی، لە کوردستانو، ئاذەربایجانی ئەمرۆدا، ژیاون، نزدیکەی چەرخی ۲۳ی بەر لە زایین، بۆیەکەمین جار، ناوی ئەم هۆزە، لە تەتەڵەکانی شای (ئاکدی)دا، وە بەر چاو دەکەوێ. ناوی ئەم شایە، (نارام سوئین) بوە، کە لە شەڕی گۆتیو، ئاکیدیدا، دەکوژرێو، کوتێکان دەس بە سەر،وڵاتەکانی (بین‌النهرین) واتە: نێوان دو، زێیی گەورەی (دەجلەو، فوڕات)دا، دەگرنو، نزێکەی ۹۱ سال، بە سەر سۆمێرو، ئاکید،دا، فەرمان ڕەوایی دەکەن.

ئەم هۆزەخاوەن (شا) نەبون، بەلام لە نێوان خۆیان دا، قۆڵەمێرێکیان هەڵ دەبژاردو، بۆ ماوەیەك دەیان کردە فەرمان ڕەوای هەمو، خێلو، هۆزەکانی خۆیان.[2] لەگەڵ ئەوەشا، تا ئێستا بن چینەی نەتەوایەتی ئەم هۆزە بەباشی بۆ ئێمە بەبە لگەوەرون نە بۆتەوە، بەلام ناتوانین ئێمە ددوان بەم ڕاستە قانێ یە، دا، نەنێنو، نەڵێن؛ ئەم هۆزە (کوتی) دەگەڵ هۆزی (کورد) ئەمڕۆدا، یەك نێنو، لێك جیاوازن، ئەگەر بەباشی سەرنج بدەینەووشەی (جودی) کە کێوێکە، سەر بە چیاکانی (ئاڕاراتی) کوردستانی سەر بە تورکیاوە کە لە قوڕئانی پیرویشا هاتوە [وَاستَوَتْ عَلَى ٱلجُودِيِّ] واتە، پاپۆرەکەی حەضرەتی نوح، دوای نیشتنەوەی لافاو،

---

1 لاپەرەی ۳۹ کتێبی ناوبراو.
2 لاپەرەی ۴۱ کتێبی ناوبراو.

طوفانەکە، بە سەرچیای جوودیوە، ویستایەوە:
کێوی (جـودی) لە گـەڕی طوفـانا- کـەشتێکەی نـوحی لە، سـەر، سـەر،دانـا (هەژار)تیّ دەگەین کە کوتی - گوتی، هەرکوردی و، گوردی یە بەڵاّم لە زمـانی عەرەب دا بوتە (جودی) هەروەك چوّن (گوندی) بوّتە (جـوندی) - هـەر لەم کتێبەدا، دەربارەی (ماد)یشەوە نووسراوە: لە سەرەتای چەرخی حەوتەمی بەر، لە زایین‌دا ئەم هوّزە میرایەتێکی زوّر بە هێزو، تـوانـایان پێکەوەنـاوە، کـە لە سـەر تەتەڵەکانی میرانو، فەرمان ڕەوایانی (ئـاشوّری)دا، نـوسراوەتـەوەو، بـە نـاوی کوردوّ، کاردوّ: کاردوًخی، قورّدوّخی‌و، ناوی تروە، باسیان لێوە کراوە. [1]سـێهەم خونکاری تاشوّری بە نـاوی (ئـاداد- نـیراری) لە سـالی ۸۱۲ی بـەر: لەزاییـن هێرشی بردوّتە سەر کوردەکانی لای باکوری کورستانی ئەمروّ:[2] هەر لە سەرەتای مێژورا، چیای (زاگروّس) زێدو، نیشتمانی گەلە کانی وەکو (لوّلوّ) و (گوّتی) و (خالّدی- خالطی) و (سوّبارو- هوری) بوّوە، لای باشوری روژ هـەلاّتی ئـەم چیایە، (عێلامی) بوون، کە جگە لەمان، ئەوانی کە گشتیان بنەچەکەی هەرەکەونی گەلی کوردن. لە روّژگاری کەونارا، داناوی کورد، بەم چەشنە بوّوە:

لای سوّمێریەکان: گوّتی، جوّتی، جـودی): لای ئاشوریەکـان: گـوّتی، کـوتی، کورتی، کاردوّ. کارداکا، کاردان، کارکتان، کارداك) بـوگە: لای روّمـانی‌و یونـانی: کــاردوّسوّی، کـــارد خـــوّی، کـــاردوّك، کـــاردوّکـــی، کــەردوّخی) لای ئەرمەنێکان: کوردوّئین، کورچیخ، کـورتیخ، کـەرخـی، کـورخـی): لای عـەرەب: کـــوردی، کـــاردوّی، بـــاقاردا، کـارتاویە، جـوردی، جـوّدی) [3] هـەڵبەت مـن (موحەمّەدپور) خوّم لە سەر ئەو باوەڕەم. کە ووشەی دیاربەکری ئەمروّش وەکو (ئامێد) هەرباشماوەی سەردەمی مادە، بەلاّم (باقوردا)یان (باقاردا) گوّڕدراوەو،

---

[1] کتێبی دانیشی بەشەر، لاپەرەی ۷۱۹ بەرگی یەکـەم، ئاداب و، ڕسـومی کـوردان لاپـەرەی ۳۹: «داشبەندی - موحەمّەدپور»
[2] ۲ لاپەرەی ۱۱۴ کتێبی شەرەفنامەی، ماموّستا هەژار:
[3] ۳ لاپەرەکانی ۱۱۵ و ۱۱٦ی کتێبی ناوبراو:

بۆته (بەكر)و (ديار)يش كه هەر به واتاى ولاٌتەو، له پێش و وشه كەدا، بۆو، هەيە، هەر هى ئەو سەردەمەيەو به گشتى واتاى (ولاٌتى كورد) دەدەن: [1] كه وابوو، رون بۆوە، كه ووشەى (كورمانج) زۆر، بەر له ووشەى (كورد) له نێو هۆزى (ماد)ى باپيره گەورەى ئێمەى كورد، دا به ديهاتۆوەو، هەردك ووشه كه (كورماجو، كورد) هەرواتا يەك دەدنو، هەمو نەتەو، خێلٌ، تيرەو، وەچەو، بەرەو، كۆمەڵه كانى ئـەم نەتەوەيە، دەگرنەوەو، و، هەريەكن و، جيايى ناوى ڕواڵەتى نابێته هۆى جياوازى بنەڕەتى و، نەتەوايەتىەوە ئەم حەمى كوردو، كورمانجين.

## كۆشك و قەلاكانى دينەوەر

هەر وەك ابوحنيفه ئەحمەد كورى داود، كوڕى وەنەند دينەوەرى له كـتێبى (اخبارُالِطوال)داكه له نيوەى دوهەمى سەدەى سێهەمى كۆچى مانگى دا، دانراوە، دەنوسێ: كاتى مأمون عەباسى له راپەڕينه بێ وێنه كەى بـابەكـى (خـورّمدين) ئاگادار بوو، (عبداله) كوڕى تاهير كوڕى (حوسێن) كـه سـێ هـەمين ئـەميرى زنـجيرەى تـاهيريان بـوو (٢٥٩-٢٠٦ هـ ق) كـه له سـاڵى ٢١٣ راتـا ٢٣٠ هـ ق پادشايەتيان كردووە به سوپايەكى يەك جار زۆروۆپر چەك و چوڵەوە نارده سـەر (بابەك) كه ئەوساكه له شارى (دينەوەر) دا خۆى سەقام گير كردبوو. (عەبدولاً له شارى (حەلوان)ەوە بەرەو (دينەوەر) كەوته ڕێ. له ڕێگادا كه هێشتا ماوە لێكى مابوو بگاته دينەوەر وە له شوێنێك داكه ئێستاش هەر به ناوى كۆشكى عەبدولاّى كوڕى تاهير نێو دەبرێ بارگەو بنەى شەرو خێوەتى، تێدا داخستوە ئيستا دەورو بەرى ئەو جێگايه ڕەزستانو، باغاتێكى گەوەرو نێو به دەرەوى ئەو مەڵبەندەيە.

(ابوالقاسم عـبداله) كوڕى موحەمّەدى كاشانى له لاپـەرەى ٢٢١ى كـتيبى (تاريخى ئول جايتۆ - خودا بەندە) داكه به هەوڵو تێكۆشانى مەهينى هەمبەڵى له

[1] من ئەم باسەم له كتێبى (پژوهشى دربارەى جەزەرى) به درێژى نووسيوە (محمدپور داشبەندى):

ساڵی ۱۳۴۸ی هەتاوی دا چاپکراوە، دەنووسیٚ: عەلی کوڕی ابوالفتح شنبانی لە ڕۆژی سیٚزدە هەمی مانگی ذیحجّەی ساڵی ۷۱۶ هق دا لە دینەوەر وەفاتی کرد،وە لە قەلاّیەك دا هەر بە نیٚوی شەنبانی کە لە دینەوەر دایە نیٚرژاوە.

قەلاّی بزەڕۆ واتە بزە ڕوود (چەم) وەك لە کتیٚبی فەرهەنگی جـوگرافیـای ئیران بەرگی ۵ لاپەرەری ۵۳دا هاتوە ئەم قەلاّیە لە نیٚوان باغاتیٚکی سەر سەوز دا بنیات نراوە کە ئیٚستاش ئاسەواری ئەو قەلاّیە لە سەرووی ئاوایی (بزەرۆ)دا، وە بەر چاو دەکەویٚ. خشت و سوّاڵەتیٚکی زۆر لە دەورو بەری ئەو قەلاّیە دەبیندریٚ دیارە زۆر لەم سوّاڵەتانە لە بّاری میٚژوییەوە دەچنەوەسەردەمی صەفەویٚکان. ئەو ئاوایّیە یەکیٚکە لەگوندەکانی ناوچەی دینەوەر و ۵۰کیلۆمیتری باکوری ڕۆژئاوای شاری (صەحنە)و ۳کیلۆمیتری ئاوایی (کەندوّلە-کەنوّلە)

قەلاّی مەردان: هەروەك لە لاپەرەی ۳۹۵ی کتیٚبی (کرماشاهان وکوردستان) دانراوی دوکتور مەسعوود گوّلزاری دا هاتوە ئەم قەلاّیە لە ئاوایـی (کـەندوّلە)دا هەڵکەوتوّە. (کەندوّلە کە سەر بـە هـەریٚمی دیـنەوەرە ئـەمڕۆ بـوّتە شـارۆڵکەی ناوەندی ئاواییٚکـانی (دیـنەوەر)و بـەشی شـاری (صـەحنە) کـە کـەوتوّتە ۵۲ کیلۆمیتری باکوری ڕۆژئاوای ئـەم شـارەو ۲۴ کـیلۆمیتری ڕوژئـاوای جـادەی کرماشانو (سونقورە)وە، ئەم قەلاّیە کە وتوّتە سەر چیّای (لمە) کە ئـەم چیّـایە خۆی کە وتوّتە لای باکوری ڕۆژ هەلاتی (کەندوّلە)وە. بەلای خەڵکی ناوچەوە، وا مەشهووربوّوە کە (مەڕوان) خەلیفەی ئەمەوی کاتیٚ لە بەغداوە ڕای‌کرد بوو هاتبّوە ناوچەی (دینەوەر)، لەم قەلایەدا خۆی شاردبوّوەو بە پەنامەکی لە ویٚدا دەژیا.

نغمی ژیٚر زەوینی کەندوّلە هەروەك لە ناو خەڵکا بلاّو بوّتەوە ئەم نغمەش هەر یەکیٚك بوّوە، لەو شوّینانەی کە (مەڕوان) خوی تیٚدا شاردوّتەوە سـەریٚکی ئـەو نغمو، توّنیٚلە لە دوّلٚ وگەلّی هانا جافر: (واتە کانی و سەر چاوەی جافر- جەفەر- جەعفەر)ەوەهەڵ‌گیراوەکەدەکەویٚتەلای باکوری‌کەندوّلەوە.سەرەکەی دیکەشی لە دوّلّی قەلاّی مەردانەوە ڕاکیٚشراوە. بەگوتەی خەڵکی ناوچە ئەو جیٚگایە شوّیٚنی لیٚ شاردنەوەی نەغدینەو حاشاردانی شت‌ومەکی بەنرخ‌و ئانتیکەی(مەڕوان) بوّوە.

## (پیرەدار، چناری پڕ تەمەن)

هـەر بـەم جـۆرەی لە لاپـەرەکـانی ۲۹۰ تـا ۲۹۸ کـتێبی (کرمـاشان و کوردستان)دا هاتۆوە، چنارێکی لە مێژینەی تەمووگەورەو پرتەمەن لە نـاوەندی ئاوایی (عبدالمحمد)دا کە، کەوتۆتە ۳۹ کیلۆمیتری باکوری رۆژئـاوای شـاری صەحەنەو ۱۵ کیلۆمیتری رۆژئـاوای جـادەی کرمـاشان و سـونقورەوە، خـۆی دەنوێنی. ئەو دارە چنارە کۆنترین و بە تەمەنترین داری ئەو مەڵبەندەیە. دیارە بە هۆی ئەو هەمرو تیرەگ و کوڵەکەی وەبەری دراوەو، ئەم گشتە تۆق و ئاڵقەیەی لە نێو قەدو تەمووی ئەو دارە هاڵێن دراوە، نەم تۆانی بە رزاییو و بارستاییو ئەستووری ئەم دارە بپێومووئەندازەی بگرم،بەلاّم رەنگە تەمەنی ئەم چنارە ۵۰۰ ساڵ پترْ بیْ. ئەو چنارە لە لایەن خەڵکی ناوچە وەڕە، رێزی لیْ دەگیریْ و، بۆتە زیارتگای ئاوایی (عبدالمحمد)و ئاواییکانی تری دەورو بەری ئەو هەرێمە.

## زاناو، ناودارانی دینەوەر

هەروەك دەزانینو ئاشکراشە ئەو خزمەت وراڤەی زاناو خوا پەرستەکانی گەلی (کورد) هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە لە ساڵی ۲۱کۆچی مانگی دا ۶۴۲ - ز) تائێستا بەم ئایینە پێروزەیان کردۆ،تەنانەت خودی عەرەبەکان بەو ئایینەیان نـە کردۆ. بە لاّم کاتیْ دەروانینە هەرکتێبخانەیەك لە ولاّتە ئیسلامیْکاندا،بە صەدان کتێب و نووسراوەی زاناکوردەکانمان بە زمانی عەرەبیو فارسیو تورکی وە بەر چاو دەکەویْ. دەگەڵ ئەوەش دا زۆر کەم،وە بە دەگمەن نێوی نووسەرەکانیان بە ناوی کوردەوە هێناوەتە نێو، نێوان. دیارە هێندێك بلیمەت و زانای وەك (ئیمـام موحەمّەد غەزالی تووسی ۵۰۵ - ۴۴۰ هـ ق)وە هێندێك کەسی ترْ نەیان توانیوە ئەم راستە قاینیە بشارنەوە. جا ئەوەیە وەك مامۆستا هەژاری رەحمەتی و ئـایەتوڵلە

موطەهەّریش دەگێرنەوە. ئیمام غەزالی فەرموویەتی:[1] کۆشکی خاوەن شکۆی ئایینی ئیسلام لە سەر سێ کۆڵەکە راوەستاوە. ئەگەر خوداوەندی میری مەزن ئەو کۆڵەکانەی دانەمەزراندبایە ئەم کۆشکە بە تەواوەتی دەڕوو خاوو تێك دەتەپی. ئەو سێ دیرەگە ئەستوورەش بریتین لە زانایانی (دینەوەری ، ئامێدی،وە شارە زووری ) کورد. ئاشکرایە ئێمەش لێرەدا بە پێی توانا باسی چەند ئەستێرەیەك لەو ئەستێرەوورشە دارانەی گۆشەیەك لە ئاسمانی ولاتی کوردستانی بەر بلاوی پەرەم پەرەم بوودا،واتە: (دینەوەر) دەخەینە روو. بۆئەوەی جارێکی تر ڕوونمان کردبێتەوە کە تە نانەت لەم هەرێمە چووکە دا چەند زانای بەناو بانگ،ئەویش لە ماوەیەکی زۆر کەم دا خزمەتیان بە ئایینی ئیسلام‌و بەرەی ئادەمیزاد،بەگشتی کردوّوە.

## ١ - ابن السُّنّی دینەوەری

ئەبوبەکر کوڕی ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی موحەمەد کوڕی ئیسحاق نێودێر بە (این السنّی ) یەکێك بوو لە هەرە زاناو فەرماییش گێرەوە گەورەکانی حەزرەتی رەسوولو یەکێك بۆوە، لە ناودارە بەرزەکانی زانستی ئیسلامەتی چەرخی چوارەمی کۆچی مانگی،کە لە ساڵی ٣٦٤ دا وەفاتی کردوّوە. ئەم زاتە پیرۆزە چەند کتیبێکی وەکوو (اَلایجازُ فی الحدیث ) (القناعة و عمل الیوم واللّیلَةَ ) داناوە. [2]

---

١ دیوانی مەلای جەزیری شەرحی مامۆستا هەژار لاپەرەی ٥. کتێبی فەرهەنگی موتە قابیلی ئێران و ئیسلام موطەهەّری

٢ لۆغەتنامەی دێخودا پیتی ئەلف ص ١٢٨٢

## ٢ـ ئەبوو بەکر موحەمەد بورهان دینەوەری:

موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی نێو دێر بە (ئەبووبەکر)و ناسراو بە (بورهان) خەڵکی دینەوەرەوەیەکێکە لە زانا هەڵکەوتوو ناودارەکانی سەر دەمی خۆی لە فەرماییش گێرانەوەی حەزرەتی رەسووڵدا. ئەم زاتە لە ساڵی ٣٤٩ دا لە دینەورەوە دەچیتە شاری (بەغدا)و، تاکۆتایی تەمەنی پڕ پیتی لەوێ دەمێنێتەوە. [١]

## ٣ـ ئەبوو جەعفەر موحەممەد دینەوەری نەحوی

ئەبوو موحەمەد جەعفەر کوڕی هارۆون کوڕی ئێبراهیم زانای بەناو بانگ‌و، و نێو بە دەرەوەی کوردەبە یەکێك لە مامۆستا بلیمەتەکانی سەردەمی خۆی لە زانستی (نەحوی عەرەبی)دا نراوە. شاذانی (نەحوو) زانێ لە ساڵی ٣٤٤ دا لە زمان ئەمانەوە هێندێك بیروڕای سەبارەت بە بابەتەکانی ئەم زانستە دەر بریوە [٢]

## ٤ - ئەبوو عەبدوڵا دینەوەری:

ئەبوو عەبدوڵا موحەمەد کوری عەبدولخالەق دینەوەری بە یەکێك لە هەرە پیاوە گەورەو خواناسەکانی سەردەمی چەرخی چوارم ژمێردراوە‌،دەربارەی ئەم شەخصە بەم جوورە نوسراوە. (هُوَمِن ا اَجلّ اَلمشایخ و اَکبرهم حالا و افصَحهم فِی عُلُوم هذاه الطائِفَة) ئە بوو، ئەبو عەبدوڵا لە شاری (دینەوەر) داهاتۆتە دونیاوە، بەلام بۆ پەرەپێی دانی زانست زۆر جێگاگە راوە و پاشان هاتۆتەوە شاری دینەوەرو لە ساڵەکانی نێوان ٣٧٠ - ٣٨٠ دا هەر لەوێ وەفات دەکا.

---

١ تاریخی بەغداج س ص ٨٢ مشاهیر کورد بابامردوخ ص ١٧
٢ معجم‌الادباء ج ٧ ص ٢٠٥ مشاهیر ١٨

ئەمەش یەکێکە لە فەرماییشە جوانەکانی ئەوان: ئەگەر لاووگەنجێك لەگەڵ پیاوی گەورەدا ببێتە هاواڵ و هاودەم-ئەوە دەبێتە هۆی خۆشبەختی ئەوو نیشانەی گەورەیی ئەمان.[1]

## ٥ - ابن میهران دینەوەری:

ئەبوو بەکر ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی مێهران زانایەك بوّوە، لە زانا ناودارەکانی کوردی خودا پەرست و چازانی سەردەمی خۆی، ئەو زاتە کە لە سەر رەوشتی (ئیمام مالیك) بوّلە زانستی جوان خوێندنەوەو،لێك دانەوەشا، واتە: لیك دانەوەی قورئانی پیرۆزیشا گەلێك بە دەسەلات و خاوەن را، بوّوە. لە ساڵی ٣٨١ دا وەفاتی کردوّوە. لە نووسراوەکانی ئەمان ئەم کتیبانە ماوون: آلشَّامِلُ فِي آلقِرآآت ، الْغايةُ فی القِرِاآتِ، کتابُ سُجُود القُرآن)[2]

## ٦ - محمد ابن عبداله دینەوەری

محمد کوڕی عبداله کوڕی مێرانەزانایەکی گەلێك نێو دێرو بە دەسەلات بوّوە لە زانستی فەرماییشەکانی حەزرەتی رەسووڵی خۆشەویستا. دوای کۆتایی هینانی زانستەکانی ئەو سەردەمە لە (بەغدا)دا، نیشتەجێ دەبێ و دەست دەکا بە گوتنەوەی یانە (درس) ئایینێ کان و فەرماییشە بە نرخەکانی حەزرەتی رەسووڵ. پاش رابواردنی تەمەنێکی پڕپیت لە ساڵی ٢٨٨ دادنیا جێ دێلێ‌و، رووّدەکاتەوە بەر قاپێکەی زاتی باری [3]

---

١ طبقات الشعرا ص ١٨ بابامروخ ج ١
٢ هَدِيَّةُ العارفين ج م ص ٦٧ مشاهير کورد بابامردوخ ص ١٩
٣ تاریخی بەغدا ج ل ص ٤٣٢ مشاهير ص ٩

## ٧- ئەبوو عەلی احمد دینەوەری:

ئەبوو عەلی ئەحمەد کوڕی جەعفەر خەڵکی (دینەوەر) بە یەکێك لە هەرە زاناو هێژا هەڵکەوتووەکانی زانستی ئیسلامەتی چەرخی سێهەم بە تایەبەت زانستی (نەحوو) ئەژمێردراوە. لە شاری (دینەوەر)وە ڕووی کردوّتە شارەکانی (بەصرە) و (بەغدا)وە بەلای (مازەنی) (موبەڕّەد)ەوە، کتیبیٚ (الکتاب)ی سێبەوەی هی دەخوێنی و لەوێشەوە دەچی بۆ (میصر) و تاکۆتایی ژیانی لە ساڵەکانی ٢٩٠-٢٨٩دا خەریکی دەرس گوتنەوە دەبی: نووسراوەکانی بریتین لە کتیبیٚ: (اصلاحُ المنِطق) المهذب فی النحو( وه (ضَمائِرُالقرآن)

## ٨- ابوبکر کسائی دینەوەری:

ئەم خوّاناسە زاناو بە ناو بانگە فەقێو شاگردی شێخ جونەیدی بەغدایی بوّوە کە لە سالی ٢٩٧ دا وەفاتی کردوّوە. مەولانا عبدالرحمن جامی لە کتێبیٚ (نفحاتُ الانس) دا دەربارەی ئەم زاتەوە دەنوسسیٚ: ئەبوو بەکر کەسائی خەڵکی (قوهستان)ی ئێراق بوّوە. دیارە قوّهستان وەرگەراوەی (کوهستان)ە چونکە لە سەرەتایی ئیسلامەتی دا،ناوچە شاخاویٚ کانی ولاتی ئێمەیان وەك کوردستان، کرماشان، دینەوەر و هیتریان بە (قوّهستان) جیبال (جِبال) دادەناو تا (اصفهان) و شاری (رِیٚ) (دامەغان) پیشان بە (ئێراقی عەجەم) دادە نا. (شێخ جونەید) دەربارەی کە سایێ دینەوەریوە دەڵیٚ: ئەگەر ئەبوو بەکری کەسائی لە عێراقدا نەبوّایە من لە ویٚ نەدەمامەوە. دینەوەری بەر لە شێخ جونەید کوّچی دوّایی دەکاو، هەر لە (بەغداش) بە خاك دەسپێر دریٚ [١]

---

١ نفحات الانس ص ١٢٧ مشاهیر ج ١ ص ١١

## ٩- ابوبكر ضرّاب دینەوەری:

ئەبوو بەکر ئەحمەد دینەوەری پاش رابواردنی تەمەنی لاوەتی چوّتە شاری بەغدا و دوّای تەواوکردنی زانستە ئاینیەکان هەر لەویٚ دەست دەکا بەگوتنەوەی زانست (حەدیث و ئەخبار) دیارە ئەم زاتەش یەکیّك بوّوە لە زانا بەناو بانگە هەڵکەوتووەکانی زانستی فەرماییشی حەزرەتی رەسوولْ. ئەم زاتە لە ساڵی ٣٢٨ داکوّچی دوّایی کردوە [١]

## ١٠- صائیغ دینەوەری

ابوالحسن عەلی کوڕی سەهل، ئەم پیاوە خوّاناسە گەورەیە بە یەکیك لە زاناکانی بەناوبانگی ئیسلامەتی سەردەمی خوّی دا ناسراوە. شیّخ ابوالحسن (قەرانی) و ابوعثمان (مەغریبی) بەلای ئەمانەوە دەرسیان خویّندوّوە، ئەبوو عوثمان دەربارەی دینەوەریوّ دەلیّ: هیچ مروّیەکەم لە صائیغی بەسام و هەیبەتر نەدیوە،کە ئەمەش لە خواوە بوّوە. دینەوەری پاش ماوەیەك ڕوودەکاتە ولاّتی میصرو هەر لە ویّش لە ساڵەکانی ٣٣١-٣٣٠ دا وەفات دەکا.[٢]

## ١١: ئەحمەد، کوّڕی مەروان، دینەوەری:

ئەم ذاتە، بە یەکیّك لە زاناو، خوا پەرەستە گەورەکانی سەردەمی خوّی دانراوە، دینەوەری کە لە سەر، ڕەوشتی (ئیمام مالیك) بوّوە، لە زانستی حەدیثیش دا، دەستیّکی بەرزی هەبوّوە. ماوەیەك لە شاری (ئەسوانی) میصر،دا کارو،باری داوەری نیّوان خەڵکی لە لایەن میّریّوە، پیّی دەسپیّردریّو،کاری دەرس

---

١ تاریخی بەغدا ج ٤ ص ٤٢٧ مشاهیر ص ١٢

٢ نفحات الانس ص ٢٦٢ ـ مشاهیر کرد ص ١٣

گوتنەوەش هەر بە ڕێوە دەبا، تا ئەوەی ، پاش ڕابواردنی تەمەنێکی پڕ خێرو، بەرەکەت. لەساڵی ٣٣٣ دا، وەفات دەکاو، هەر لە شاری (ئەسوان)یشدا، تەرمە پیرۆزەکەی بە خاك دەسپێردرێ: یان لە شاری (قاهیرە)دا: کتێبی: اَلْمجالَسَةُ، جَواهِرُاَلعِلْم فيِ اَلحَديث،و، مناقِبُ إما مالِک، و مَحاسِنُ النوادر، والآثار) لە ٢٥ بەرگدا، لەم زانا کوردە خواناسەوە، بە جێ ماونَ:

## ١٢ - ابوالعباس ئەحمەد کوری محمد دینەوەری:

ابوالعباس یەکێکە لە زانا بەناو بانگەکانی خواناس و بلیمەتی گەلی کوردی سەردەمی خوێ. ماوەیەکی زۆر دەگەل خواناسە نیودێرەکانی وەکوو (یوسف) کوری حەسەن، عبداله کوری (خەرّاز) ابوالمحمد جەریری، ابوالعباس کوری (عەطا)دا رۆژگاری بردوّتە سەرو بە دوا هەمین پەلەی خواناسی گەییشتوّوە. دوایی دەچێتە شاری (نەیشابووری) خوراسان و لەوێ دا خەرێکی ڕێنوێنی خەڵك دەبێ. لە کوتایی تەمەنی پرپیتی دا دچێتە شاری (سەمەرقەند)و، لە ساڵی ٣٤٠ دا فەرمانی خوا بە جێ دێنی و کوچی دوایی دەکا،یەکێك لە کتێبە بە نرخەکانی ئەم زاتە کتێبی (القناعة)یە. [١]

## ١٣ - شێخ ئەحمەد ئەسوەد دینەوەری:

شێخ ئەحمەدە رەشە، خواناسێکی کەم وێنەو پارێزگارو هەڵکەوتوویەکی بێهاوتای کورد بوّوە. لە رەوشتی خواناسیشدا سەر زنجیرەی خواناسانی سوهرەوەردی کورد بوّوە.لە لایەن شێخ مەم شاد دینەوەریوە ئیزن و ئیجازەی ڕێنوێنی خەڵکی دینەوەری، پێ دراوە[٢] ١٤ـ ئەبو بەکر، کوری، داوود، دینەوەری:

---

١ طبقات الکبری ص ١٢١ کشف الظنون ج ٢ ص ٢٩٥ مشاهیر ج ١ ص ١٥

٢ مەناقیبی ئەحمەدیە ص ٢٦٧. مشاهیر کورد ص ١٥

ئەم زاتە پیرۆزە لە پیاو چاکانی خوایی خەڵکی دینەوەر بۆوە. کە پاش ماوەیەکی زۆر دەرس دانەوەی فەقێی و خوێندکارانی دینەوەر: دەچێتە شام و لە وێدا دەمێنێتەوەو. دەگەل خوّاناسانی وەك ابوبکر (روقاقی) ابـوعبداله (جـەلا)دا دەبـێتە هاوالْ و ماوەیەك دەگەڵیان دا رادەبێرێ. ئەم زاتە دەستی یارمەتی بۆ لای هیچ کەس راناکێشێ و بە دەست و زندو باسکی خۆی،ژیانی روژانـەی وە دەست دەخـا. یەکێك لە ووتـە بـە نـرخـەکـانی ئـەم زاتـە ئـەوەیە: مـێعدەی مـروڤ شـوێنی خوّاردەمەنی یە. ئەگەر شتی حەلاڵی بچێتە ناوەوە،توّانا و هێزی خوّاپـەرستی لە مروڤا گەشە دەکاو پەرە دەستێنی . بەلاّم ئەگـەر شـتی حـەرامـی تـێکرێ هـوێ نافەرمانی لە مروڤ دا پەرەدەستێنی. ئەگەر شتی گومان لێکراوی تێ کرێ رێگای راستەقانی خوّا پەرستی وون دەبێ. دینەوەری لە ساڵی ٣٥٠ دا پاش رابوّاردنـی صد ساڵ تەمەن،کۆچی دوّایی دەکاو لە (شام)دا بە خاك دەسپێردرێ. [١]

## ١٥ - قاضی ابوالقاسم یوسف گەچی دینەوەری

گەچی کوّری ئەحمەد کوّری یوّسف هێژاو زانایەکی کوردە، کـە لە سـەر مەذهەبی ئیمامی (شافیعی) بوّوە. ئەم زاتە، کردەوەو زانستی شان بە شانی یەکتر هاتوّتەوە. شاری دینەوەرو ناوچە بە تیشکی هەتاوی ئـەو روون بـوّتەوە، ئـەو هەرێمە بوّتە ناوەندێکی گەورەو خوێندنگای هەموو زانستە ئیسلامێکـانی ئـەو سەردەمە. زوّر زانای وەک کورّی (قەطان) ابوالقاسم (دارەکی) ابوحامد مەروەزی (مەروەیی) لە خزمەتی دا ماونەتەوەو بوّ فێر بوّنی زانست لە خزمەتی دا بە چوّك داهاتوون. کاتی شێخ ابوعلی حوّسێن کوّری شوعەیب (سەنجی) لە خزمەت شێخ ابوحامد (ئیسفەراییـنی) ئیجازەی ماموّستایەتی وەر دەگرێ و دەگەرێتەوە ولاّت و دەبێتە میوانی (قاضی گەچی) دەربارەی چەند مەبەستی گرینگی زانستی (کە لام)

---

١ نفحات الانس ص ٢٠٠ مشاهیر ج ١ ص ١٦

و (مەنطیق)و هیتر دەگەڵی دا، دەکەویتە،ووتو، ویژو دەمەتەقیوە. بوی دەردەکەوی کە قاضی وەکوو، مەلەوان و دەریا بازیکی کارامە لە نیو دەریای زانستەکانی ئایینی دامپی مەلی دەکا، پیی دەلی: مامۆستا: زانست و هیژاییبەبە، ژنی تۆ بڕاوە؟ بەلام ناوو ناودی ریکەی بە شیخ ابوحامد (ئیسفەرایینی) بڕاوە قاضی لە وولاما، دەفەرموی:(حَطَّتْنِي دِينَوَرْدُ وَ رَفَعَتْهُ اَلْبَغْدادُ)واتە دینەوەر منی چووکە کردوتەوە و بەغداش ابوحامیدی گەورە کردوتەوە. قاضی کتیبی بە نرخی یەك جار زۆر هەبوە. بە لام بە داخەوە وەك، زۆربەی.مامۆستاو، نووسەرانی کوردی دیکەی ئەو سەردەمە وبگرە تا دەگاتە ئیستاش،لە بەر بی خودانیوو بی کەسی بوتە خۆراکی مشك و جیگەی نانەوەی تەونی جالجالوکەو، لە ئاکاما، نەکەوتونەتە، دەس خەلکەوە. قاضی سەرەرای ئەم گشتە کارو بارەی دەرس گوتنەوەیەماوەیەکی زۆریش ئەرکی داوەری شاری (دینەوەر) و ناوچەی بە ئەستوە بووە. دیارە بۆیە پیی گوتراوە (قاضی گەچی) چوونکو باوکی قسل و گیچ، فرۆش بووە.

ئەم زاتە هیژایە لە ٢٧ ی مانگی رەمەضانی ساڵی ۴٠۵ کوچی مانگی دا لە لایەن خوا نەناسەکانی ئەو سەردەمەوە رەشەکوش دەکری و بارگەو بنەی پی بەرەو ماڵی هەمیشە یی تیك دەندری.[1]

## ١٦ ابوسعید دینەوەری:

ابوسعید نەصر کوری یەعقووب نیو دیر بە (بەغدایی) یەکیکە لە پیاوە زاناکانی سەردەمی خوی بە تایەبەت لە زانستی لیك دانەوەی (خەون)دا. ئەم زانا کوردە ماوەیەکی زۆر لە شاری (نەیشابوور)دا کاری داوەری دیوانی سوڵطان عین‌الدولە (محمود سبوگ تەگین) ۴٢١ - ٣٧٧ ه ق) هەبوە، و. بە سەر گشت کارەکانی دەرباردا، راگەییشتوە.

---

١ وفیات الاعیان - ابی خەلەکان ج ٢ ص ٣۴٨ مشاهیر ج ١ ص ٢١

تەنانت ئەوەندە جێگەی موتمانەی سوڵطان بۆوەکە هەموو نامە نهێنیەکانی نـێوان شـاە و خـەلیفەی بـەغدا (القـادربِالله ٣٨٩-٤٢٢ ه ق) بـە دەست ئـەو نووسراون‌و، ولآمیان د راوەتـەوە. دینـەوەری چـەند کـتێبی بـە نـرخـیشی وەك (شِمارُالانس فی تشبیهاتِ القُرس) (رَوایع التوجیهات فی بدایع التشبیهات) (تعبیرُ القادر) نووسیوە.[1] دیارە وەك لە کتێبی (هَدِیَّةُ العارفین) دا هاتۆوە ابوسعید لە ساڵی ٣٩٧ دا وەفاتی کردۆوە.

## ١٧ - ابوبکر محمد مقری دینەوەری:

ابوبکر محمد کوڕی مظفر کوڕی عەلی زانا و مامۆستایەکی چازانی زانستی جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و لێك دانەوەی ئایەتەکانی کـەلامی خـوداو فەرمایشەکانی حەزرەتی رەسووڵی خۆشەویست بووەو،لە ساڵی ٤١٥ دا پـاش ڕابواردنی تەمەنێکی پر لە خێرو، بەرەکەت، بارگەو بنەی بۆماڵی هەمیشەیی تێک ناوەو،خودا حافیظی لەگەڵ‌و نیشتمانەکەی کردۆوە.[2]

## ١٨ - ابونصر احمد دینەوەری:

ئەحمەد کوڕی فەرەج خەڵکی دینەوەر لە شاری ناوبراو داهاتۆتە دونیاو، لە شاری بەغدا وەفاتی کردۆوە،ئەم زاتە پیرۆزە پیاوێکی گەلێك خواناس وخاوەن خوو، خدەی باش بۆوە، و لە زانستەکانی ئایینیش دا دەستێکی بەرزی هـەبۆوە. (فخرالنسا شەهدە دینەوەری بە ناوبانگیش کە نیشك‌و دەست پـەروەردەی ئـەم مامۆستا زاناو بەرێزەیە).[3]

---

١ هَدِیَّةُ العارفین ج ٢ ص ٤٩٠ اعلام زرکەلی ج ٨ ص ٣٥ بابامردوخ ج ١ ص ٢٢
٢ تاریخی بەغدا ج ٣ ص ٢٦٥ مشاهیر ص ٢٢
٣ وَفِیّات الأعیان ج ١ ص ٢٢٦ مشاهیر ج ١ ص ٣٣

## ١٩ - ابوالحسن دینەوەری:

ابوالحسن کوڕی موطەهەری دینەوەری یەکیك بوّوە لە فـەقێ‌و شـاگـردە ناودارەکانی ئیمام موحەممەد غەزالی (٥٠٥-٤٤٠ ) کە لە سالّی ٥٣٥ کـوچێی مانگی دا وەفاتی کردوّوە [1]

## ٢٠ - شیخ ابونصر احمد دینەوەری مقری:

شیخ ابونصر کوڕی حوسین خەڵکی دینەوەر نـاسراو بـە (کِسـارمقری) یەکێك بوّوە لە ماموستا گەورەکانی زانستی خوێندنەوەی قورئان ولێك دانەوەی واتاکانی. ئەم زاتە لە سالّی ٤٣٣ دا وەفاتی کردوّوە.
یەکێك لە کتیبی ئەوان ناوی (المنبّە فی القراآت)ە [2]

## ٢١ - ابوبکر محمد قاری دینەوەری:

ابوبکر محمد کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیم زانـای بەنـاو بـانگی زانسـتی حەدیث و قورئان،پیاوێکی ڕوّژ خوّاناس و بە پارێز بوّوە کە لە سالی ٣٧٣ دا لە (دینەوەر) داهاتوّتە دنیاوەو، لە سالّی ٤٤٩ دا لە شاری (بەغدا) وەفاتی کردوّوە و هەر لەوێش نێژراوە.[3]

---

١ طبقات الشافِعیّة ج ٤ ص ٢٨ مشاهیر ج ١ ص ٣٧
٢ کشف الظنون ج ٢ ص ١٨٨٦ مشاهیر ٢٤
٣ تاریخی بەغدا ج ٣ ص ١٠٦ مشاهیر ٢٤

## ٢٢ - ابن الخازن دینەوەری:

ابوالفضل احمد کوڕی محمد کوری فضل کوری عبدالخالق ناسراو بە (ابن الخازن) یەکێك بوّوه لە نوسەر و هوّنەر و خەط خوّشەناوداره کانی کورد،کە چەند جار کتێبی (مقامات)ی حەریری بە خەطی خویٚ نووسیوەتەوه (ابن الخازن) دیوانێکی هەڵبەستی هەبوّوە کە لە لایەن کوڕەکەی خوّی کە ناوی (نَصرُالله ابوالفتح کاتیب) بوّوه کوّ کراوەتەوه. نصرالأش وەك باوکی نوسەرێکی زوّر نێو بە دەرەوە بوّوه. وەك قاضی کوری- خەڵکی (خەلەکان)[1] دەنووسیٚ. لە ساڵی ٥٧٥ دا ژیاوه ئەمەش نموونەی هەڵبەستی ابن‌الخازینە کە بە عەرەبی گووتوویەتی:

مَن يَستقيم يُحْرَمْ مُناهُ وَ مَن يَزِغ – يُختَصُّ بِالإسْعافِ وَالتَمكينِ
أنْظُرْ اِلَى الألِف اسْتِقَام، فَفَاتَهُ – عَجْم وفَاز بِهِ اعْوِجاجُ النَّون

واته : پیاوی راست و خوّڕاگر بە ئارەزوی خوّی ناگا. بەڵام پیاوی ناراست و ناله بارەخوشبەخت و کامڕەوایە. هەروەک چون پیتی ئەلف لە بەر راستی لە خاڵ بی بەشە: بەلام نوون (ن) لە بە ر چەوتیو ناراستی لە خاڵ (.) بەشداره.

أيا عالِمَ الأسرارِ اِنَكَ عالِم – بضعف اصْطِبارى عن مُداراة خُلْقِهِ–
فَفَتّر غَرامى فيه تَفتيرَ لَحظِهِ– وَ اَحْسَنْ عَزائى فيهِ تَحْسينَ خَلْقِهِ
فَحْمَلُ ألرَّواسى دوُنَ ما أَنَا حامِلُ– بِقَلْبِي اَلْمُعَنِّيِى مِنْ تَكاليفِ عَشْقِهِ.

واته: ئەی خودای زانا بە هەموو نهێنیٚك و، شاردراوه یەك خوّت دەزانی هێزو توّانام لیٚ براوەو، ناتوّانم کردار و خوی توندو تیژی ئەو هەڵگرم. خوت ئەو سەرلیٚ شێوایی کە دەبارەی ئەوین و ئوگری ئەوەوه هەمەکەم کەوه.

هەر بەم جوّرەی نازو هێدێتیت بەو داوەو بیٚ تا بیشت سەبارەت بەو بەمن داوه. بیٚ تابی من وه سەر باشی گێره بە وجوّرەی جوّانیت لە ئەندامەکانی ئەودا،

---

١ خەلەکان، ئاوایکە، سەر بە شاری هەولیّری کوردستانی ئەو، دیو. م-د

خولقاندۆوه. چوونکو، هەلگرتنو، خستنە سەر شانی چیا بە رزەکان لە بەران بەر باری ئەوینی ئەو داکە خستویەتە سەر دڵی پر لە خەفەتی من گەلێك سووك و هاسانترە.

ابن الخازن لە ساڵی ٥١٨ یا ٥١٢ پاش ٤٧ ساڵ تەمەن ڕابۆاردن وەفاتی کردۆوە[١]

## ٢٣ - : شەهدە دینەوەری:

شەهدە، کچی ئە بونە صر ئەحمەد، کوریٚ فەرەجی دینەوەری ، نێو دێر بە (فَخْرالنِسْاء)یە کە لە ساڵی (٤٨٢-١٠٨٩ز-) لە شاری (بەغدا)دا، هاتۆتە. دیناوە، هەر لە تاقی مەنداڵیدا، دەست دەکا بە خوێندن و، فێر بوونی زانستە ئاینیێ یەکانی ئە و سەردەمە لە ئاکامی هەولو، تێکوشانی بیٚ ووچانیدا، دەبێتە هوزان و، بلیمەتێکی بیٚ وێنەو، ناودارە شەهدە، سەرەرای خەط خوشی، دەنگێکی گەلێك زولاڵ و دلنشینی هەبوه، کە جارو بارە، بەم دەنگە ئاسمانییەی خوی کە پەلەوەری لە حەوادا، ڕادەگرت و، بالدار، لەنگەریان لە سەر، دەبەست، چەند، سورەیەکی لە قورئانی پیروز، دە خوێندەوەو، خەڵك گویان لیٚ را، دەگرت. شەهدە. لە گێرانەوەی فەرماییشەکانی خەضرەتی رەسولو، لێك دانەوەی واتا جوانەکانی قورئانی پیروزیشا، بیٚ وێنە بوە: شەهدە کە نیشتە جیٚی شاری (بەغدا) بوو، لە چوار قوژبنی ولاتەوە، خوێندکارو، فەقێی کوڕو، کچ لیٚ کوبوەو، لە زانستە بە نرخەکانی ئەم ژنە کوردە زانایە، کەلکیان وەر دەگرتو، لە خزمەتیدا، بە چوکدا، دەهاتن شەهدە دوای ڕابواردنی ٩٠ ساڵ تەمەنی پڕ لە خێرو، بەرەکەت، وەفات دەکاو، لە گەڵ شوە، زاناو، خواناسە گەورەکەیا، واتە: ثِقَةُالدّولَة) عەلی کوری موحەمّەد، ناسراو، بە آبو الحسن انباری) کە زور، بە لای

١ وفیّاتُ الأعیان ج ١ ص ٦٤ کشف الظنون ج ١ ص ٧٦٥ الاعلام ج ١ ص ٢٠٨ مشاهیر ج ١ ص ٣٤

(المتقی باالله خەلیفەی عەباسیّ وە) بەریّز بوّوە، لە گوّرستانی (بابُ آلأبرز)دا، بە ریّزیّکی زوّرەوە، بە خاك سپیّراوە.

دیارە بە هوّی ئەم خەطّو، ئینشا جوانەوە پیّی گوتراو (شَهْدَةُ الکاتبة) هەروەك پیّی گوتراوە (فخرالنّساء) شەهدە لە سالّی ۴۸۲ یا ن ۴۸۵ دا، هاتوّتە دیناوەو، لە سالّی ۵۷۴،دا کوّچی دوایی کردوّوە[1] ئاشکرایە لە ناو، کوّمەلّی کوردەواری ئیّمەدا، ویّنەی شەهدە، یەکجار زور بونو، ئیستاش هەر، هەمانن:[2]

## ۲۴ - ابن القوتەییەی دینەوەری:

ئیمام ابو محمّد، عبداللّه کوری موسلیم، کوڕی قوتەیە (واتە: قوتابیّە چوکەڵەو، خوّشەویست)ی دینەوەری کە لە سالی ۲۱۳ی کوّچی مانگیدا، لە شاری (دینەوەر) ۱، دیّتە دیناوە، دوای تەواو کردنی خویّندنی ئایینی لە زاینگە، پڕ لە خویّندگاکەی دا، بەرەو، شارەکانی (بەغدا) و، (بە صرە) و (کوفە) دەکە ویّتەریّ، دوای ماوەیەك لە شاری (بەغدا)دا، دەبیّتە، ماموّستاو، دەرس ویّژەوە،

لەماوەیەکی کەم دا، ناوبانگی زانستو، خوا پەرستنی، دینەوەری بە هەمو لایەکی ولاّتا، بلاو، دەبیّتەوەو، فەقیّی لە گشت سوچو، قوژبنیّکی ناوچە ئیسلامیّکانەوە، دیّنە بەغداو، لە خزمەت دینەوەریدا، بە چوّکادیّنو، کەلکی لیّوەر دەگرن.

دینەوەری دەگەلّ ئەوە شا، خوّی کورد، بوو، هیّندە بە سەر، زمانو، ویژەی عەرەبدا، زالّ بووّە، بوّ ئەوەی تە نانەت خودی ئەوانیش لە نووسینیو، خویّندنەوەدا، توّوشی هەڵەنەبنو، سەرەنگریّی توشیان نەیّە.کتیّبی ریّنویّنی زمانی

---

۱ تاریخ ابن خەلەکان ج ۱ ص ۲۲٦ ـ خیرات نسا ج ۲ ص ۱۱۸ مشاهیر ج ۱. ص ۴۹: داری پیرەدار (محمد پور داشبەندی)

۲ دیارە من (محمد پور داشبەندی موکری) ئەم ناودارە ئافرەتە کوردانەم لە کتیّبی: نەخشی ئافرەتی کورد، لە نیّو کوّمەڵدا، هیّناوە:

عەرەبی، بە ناوی (آدَبُ الكاتب) دەنووسیٚ، ئەم زانا مەزنە، پتر لە ۴۰ کـتیٚب و، بەرٚتوك،دا، دەنیٚ، کە یەکیٚك لە وانە کتیٚبی. (أَنْسابُ‌الاکْراد)و، (کتیٚبی التسويةُ بين العَرَبِ و الْعَجَم)ە،

دینەوەری پاش چەن سالیٚك، لە بەغداوە، دەگەریٚتەوە دینەوەرو، لە ویٚدا، دبیٚتە قاضیو، بە سەرکارو، باری خەڵکەکەدا، ڕادەگاو، ناکوٚکیٚکانیان لە ڕیٚگەی ئاینەوە، لە نیٚوان هەڵدەگریٚ.

دینەوەری هەروەك لە زانستی ئایینیو، ئیسلامەتیدا، بە دەسەڵات بووٚە، لە زانینی گیاناسی (عِلْمُ النَبّات) و، گیان لە بەر ناسیی (عِـلْمِ‌الِـحیوان) و، هـەواو، ئەستیرە ناسیشا، گەلیٚك . زاناو، بە دەسەلات بووە،هیٚندیٚک لەکتیٚبو، نوسراوەکانی تری (دینەوەری) ئەمانەن: الشِعروالشُـعراء، المعـارف، کتـاب المعـاني، عُـيُونَ الاخبار، أُلاِمامَةُ وَالسياسة، الردُ، عَلى‌الشعوبيّة، الرَّجَلُ وَالمَنزِلُ، مشكِـلُ‌القُـرآن، المشتبهُ فِي الحديث والقرآن، أَلْعَرَبُ وَ، عُلُومُهـا، المسـائل والاجـوبةُ، غـريبُ القرآن، طبقاتُ اَلشِعرِ ، و، آلشُعَراء)، دینەوەری دوای بە جـیٚ هیٚنـانی ئـەرکە گەورەو، سەنگینەکانی سەرشانی، بەوپەڕی سەر بڵیٚندیٚوە، لە ساڵ ۷۰ ـ ۷۱ دا، هەر لە زاینگەو، زیٚدە خوشەویستەکەیا (دینەوەر) کوٚچی دوایی و، مـاڵ ئـاوایـی لە خەلكو، هوٚزو، نیشتمانەکەی دەکا: ١

### ۲۵: ئەبو حەنیفە دینەوەری:

ئەحمەد کوڕی داوود، کوڕی وە نەند، لە دەیەی یەکەمی چەرخی سیٚهەمی کوٚچی مانگیدا، لە (دینەوەر) هاتوٚتە دونیاوە، دینەوەری، دوای تەواو، کـردنی خویٚندن لە شارو، ناوچەکەی خوٚیـا، بـوٚ پـەرە پـیٚدانو، بـە رەوژورتـر بـردنی زانستەکانی سەردەم، رو، دەکاتە شارەکانی (بەصرە) و (کوفە) دوایەش ، دەچیٚتە

١ الاعلام ج ۲۸۰، مشاهير ج ١ ص ۷ ، داری پیرەدار ح،

(مەدینەی مونەوّەر)و (بیتُ‌المقدس) و (دورّگەی فارس)و، دەورو بەرو، فیربونی زانستی زمان ناسیی (فِقّةُ اللّغةْ) لە ویّدا، تەواو، دەکاو، دیّتە شـاری ئیصفەهـان (٢٣٥ - هق ٨٥٠ - ز) کە ئەو ساکەتەمەنی نزیکەی ٢٥ سال بوّوە.

لەم شارەدا (رَصَدالکواکب) رەصەدخانە واتە، دەستگای ئەستیّرە نـاسی بنیات دەنیّ، ابو حەنیفە هەروەك لەویّژەو، ئەدەب، و میّژو، جوگرافیاو، ئـەستیّرە ناسیو، گیاناسیدا، زانایەکی هەڵکەوّتوو، بە ناو بانگ بوّوە، لە زانستی گیان لە بەر ناسیشدا، گەلیّك بە دەسەڵات بوّوە،زوّربەی زاناکانی ئەو سـەردەمە ئەمیـان لە بەرابەرانبەر (حاحیظ) دا، داناوەو، هیّندیّکیش بە زاناترین ریاضی زانی چەرخی سیّەمیان ناسیوە. ئەم زاتە پیروزە، سەبارەت بە میّژوو، رّابوردوی ولاتەکەی خوّی ئیّران بە گشتی و، زیّدەکەی (دینەوەر) بە تایەبەتی، ئەویّنیّکی پـر لە هـەستو، خـوّشەویستی هـەبوّوە، بـە چـەشنیّکیوا، کـە زوّربـەی کـتیّبە مـیّژوییەکـەی (أخبارُالطِوال)ی بوّ، راڤەو، رّابوردی، رّابـوردوانـی ئـیّران، تـەرخـان کـردوّوە. دینەوەری پتر لە سی کتیّبی، دەربارەی زانستە جوّراوجوّرەکانەوە نووسیوە وەك: (کتابُ‌البلدان) کتابُ‌النّبات) کتابُ‌الجـبروالمقـابلة) اصـلاحُ‌المـنطق) أنّسـابُ الأکراد) کتابُ ألانواء) کتابُ‌الکسوف، کتاب الفصاحة) کتاب الشعروالشُّـعَراء) کتاب الزیجو، الاسطرلاب،و، چەند کتیبیترە دینەوەری دوای رَابواردنی نزیکەی حەفتاو، چەند سالّ، لە نیّوان ساڵەکانی ٢٨١ - تا ٢٩١ ی کوّچی مانگیدا، خوّی بەرەوگەرانەوە بوّ ماڵی هەمیشەیی ئامادە، دەکاو، بارەگەو، بنەی لیّك دەنیّو. خوا، حافیظی لەگەلو، نیشمانەکەی دەکاو ، بەرەو بەهەشتی خوایی، دەکەویّتە ریّ:[١]

١ گاهنامەی تاران سـالی ١٣٠٧ ص ١١١، الأعـلام ج ١ ص ١١٩، مشـاهیر ج ١، ص ٨، داری پیرەدار ص ط: محمدپور)

## ٢٦: مەلا پەرێشان:

ماموٚستا ابوالقاسم، ناسراو، بە مەلا پەرێشان، کە دەسەلاٚتێکی تەواوی بە سەر زمانی فارسی و، عەرەبی و، تورکی،دا، هەبوٚوە [١] بە یەکێك لە زانا بە ناو بانگەکانی کوردی (دینەوەر) لە چەرخی نوٚهەما، دانراوەە بەلاٚم، وەك ماموٚستای چازانو، بلیمەتی هاوچەرخ (عەلی ئەکبەر دێخودا) دەنووسیٚ؛ سالٚی لە دایك بوونو، وەفاتیان، هێمان روٚن نەبوٚتەوە، تەنیا ئەوەندە ئاشکرایە، کە نزیکەی ٥٠ سالٚی رٚەبەق، لە گەل (شێخ رٚەجەبی برسی) نووسەری کتێبی: (مَشارِق الانوارو، لُبابُ حقایق الایمانو، مشارقُ الامان) دا، کە لە سالٚی ٨٠١ هـ ق ، نووسراوەتەوە، دوٚستو، هاوالٚبوون. جا بەم پێیە، دەتوانین بیژین، ماموٚستا پەریشان، لە سەرەتای چەرخی نوٚهەما، ژیاوەو، لە کوٚتایی ئەم چەرخەشا، وەفاتی کردوٚوە.

ئەوەی تا ئێستا لە نووسراوەو، هوٚنراوەکانی ئەم زاتە پیروٚزە خوداناسەوە، وە دەست ئێمە کەوتوٚوە.

(پەرێشان نامە) یە، کە بە ووشەی کوردی ئاوێتە،دەگەلٚ فارسیو، ئەرەبیو، تورکی،دا، هوٚینویٚتەوەو، بەم جوٚرە دەس پیٚ دەکا: من ژ، بِسمِالله، من ژ،بسمالله- ئیبتدا، مە،کەم، من، ژ، بسمالله (پەرێشان نامە) ذیکر، مەکەم لله- نە، ئەرای هەرکەس، بَلْ فَنا فی الله.

لارٚطبٚ، لا یابِسٚ، الا فیکتاب- کتاب، ، دەرجٚ، هەمە، وە، فَصْلَ الخطابِ.
ظاهیر، هەرشیٚئ، لە،کەتمی عەدەم- ألله، أرباب، حدوث،ژ، قِدَمْ
ئاب‌و، بادو، خاك، ئاتەش ، ظاهیرەن- عونصور، بیٚ اِمکان، مەعناش، باهیرەن.

زەمانیٚ ئەیّام، جاهلیّت بی - نە بی هات، ژ ، بەعد، نازل بی، نوبی،
لە، لیٚك، دانەوەو، پیاروانینی ئەو هەلبەستانەی بە ناوی ماموٚستا

[١] دەتواندریٚ بوٚوەدەست هێنانی هوٚی ئەم عەرەبیو، تورکیو، فارسی زانینەی ماموٚستاو، هوٚنەرەکانمان، بروٚاندرێتە پێشەکێکەی خوٚم، لە سەر دیوانی شێخ ئەحمەدی کوٚر.

پەریشانەوە، بلاّو، بونەتەوە، وا، دەر دەکەویّ لە باری ئایینیّوە، لایەنگری فَضْلُ‌الله نەعیمی تەوریّزی یان ئوستوراّبادی (٧٩٦-٧٣٠-٧٤٠) بوّوە•ناوبراو، لە کاتی دانانی کتێبی (جاویدان نامه) دا، بە دەست (میران شاه) کوڕی تەیموری لەنگ دەکوژریّ [١]

## ٢٧ - ئەلماس خان کەنوّلەیی:

سەرەەنگ ئەلّماس خان، لە ئاوایی، کەنوّلّەی سەر،بە (دینەوەر)دا، هاتوّتە، دیناوەو، یەکیّك، بوّوە لە هەرە ئەفسەرە لّی زان و، ئازاکانی سەر دەمی فەرمان رەوایەتی (نادرشای ئەفشار)، (١١٤٨-١١٦٠ هق) و، سەربازەکوردەکانی، والی ئەردەلاّنی کوردستانە بوّوێنەکاتیّ سوپای حوکومەتی عوثمانیو، ئیّران، لە قەراخی زیّی (دەجلە) و نزیّك شاری (سامەرّە) بە گـژیەکا دەچـنو، هەرکام دەیەویّ، شاری (بەغدا) بگریّتە دستە سەرهەنگ ئەلّماس خان بە خوّی و، سەربازەکوردەکانەوە جوّریّك هەلّ دەکەنە سەر سوپای عوثمانیو، تیّکیان، دەکشیّنن، کە (نادرشاه) واقی ووّر دەمیّنیّ،و، خەلاّتی دەکا: بەلاّم دوای ئەم شەرّە، ئەلّماس خان نیّوانی دەگەلّ والی کوردستان ناخوّش دەبیّو، دەگەریّتەوە (کە ندولّە) و، تا. کوّتایی ژیانی هەر لەویّ، دەمیّنیتەوەو، ئیتر، دەس لە هەمو کاریّکی سوپایی دەکیّشیتەوە: ئەلّماس خان، هەر سوپایی و. شەرّکەرو، ئازاو، دلێر نەبوّوە، بەلّکو لە گورّەپانی زانستو، هەلّبەستیشا، چوّتە بەربەرەکانی و، شان لە شان دانی کەلّە هوّنەرانیّکی وەک (میرزا شەفیع) دینەوەریّوە و، بە یەکەوە هەلّبستیان گوّریوەتەوە:

ئەوەی زانراوە سەبارەت بە سالّی وەفاتی ئەلماس خان هەر ئەوە یەکە لە

---

١ تذکره شعرإ کرماشان ص ١٢١ و ١٢٢ جغرافیای کردستان ص ٦٩، سەرسپوردەگان ص ١٥٩ لغتنامه، ر - ص ٢٩١ - مشاهیر کرد ص ١١٣. ١١٤

چەرخی ١٢ دا، بوّوە. بە لاّم ساڵە کەی تا ئیّستا بـە داخـەوە نـەزان دراوە:[١] وەك هیّندیّك لە نووسەرەکان ڕایان گەیاندوّوە ئەلماس خان جگە، لە پارچە هەڵبەستی جوّراو، جوّرو، پڕواتاو، ڕیّكو، پیّکی هەمە چەشنە، دیوانیّکی حەماسیشی، بـە لاسایی کردنەوەی شانامەی فیردەوسی هەیە، کە هیّشتا چاپ نەکراوە:

## ٢٨ - میرزا شەفیع کولیایی:

میرزا شەفیع دانیشتوی ئاوایی (ڕەزڵە) بوّوە، کە یەکیّکە، لە ئاواییەکانی ناوچەی (کولیایی بیّڵەوار) بەلاّم زوّر کەس هەر بە میرزا شەفیعی (دیـنەوەری) ناویان بردوّە، میرزا شەفیع یەکیّك بوّوە لە هەرە شاعیرە زاناو، و، بە جەو هەرەکانی سـەردەمی خوسرەوخـانی یـەکـەمی والی کوردستـان (١٢٠٦ ه ق)و، لە زوّر هەڵبەستیشا، پەسەندی ئەم والییە، کوردەی، داوە. وەك لە باسی ئەلمـاس خـانا، ڕامان گەیاند، میرزا شەفیع، لە گەڵ ئەلماس خان دا، نیّوانیان یەکجار خوّش بوّوەو، بە یەکەوە هوّنەیان گوّریوەتەوە.

میرزا، دوای مردنی (ئەڵماس خان) ڕوّژیّك بە پیی ڕەوشتی پـیّشوی، لە ئاوایی (ڕەزڵە) وە بەرەو (کەنوّڵە) دەکەویّتە ڕێ، لە نزیك ئاوایی هەواڵی مەرگی ئەلماس خانی پی دەدریّ میرزا، زوّر بە پەژارەوە، دەچیّتە سەر گڵکوّی ئەڵماس خانو، بە هەڵبەست شین و، چەمەرەی بوّ دەگیّریّو، ماڵ ئاوایی لەم کوّنە هاواڵەی دەکاو، بە جیّی دیّلیّ[٢] میرزا، زور جـار (حـاجی) کـردوّتە، نـازناوو، هـیّندیك جاریش، هەر بە (میرزا)یان (شەفیع) قنیاتی کردووّە: میرزا، تاکوّتایی چەرخی ١٢ ه‌ق ژیاوە:[٣]

میرزا شەفیع، نزاو، سکالاّنامەیەکی، ، یەك جار، بە سوّزی هـەیە، کـە بـە زاراوەی (گوّرانی) هوندراوەتەوە کە ئەمەش هـەڵبەستی یـەکـەمو، دوا هـەمینی

---

١ مشاهیر بابا مەردوخ ج ١ ص ٢٢٣ ، وەرگیراو، لە ڕوّژنامەی کوردستانەوە

٢ ئەم شەپوّڕ نامەیە ١٣ هەڵبەستە: ص ١٥٤-١٥٥ گوڵزاری لوّرستان

٣ مناجاتهای جاویدان ئەدەبی کوردی ص ٩٢ مشاهیر کرد ج ١ ص ٢٥٩ - ٢٦٠

هەلبەستی ئەم پارانەوەیە:

تاك، توانا، تاك تەوانا ـ أللہ لاشریك تاك تەوانا

ئۆمێد، نەدەرگات پەی خەلاصیەن ـ ئافەریدەی تۆن، ئەرصەد، عاصیەن:

## ٢٩ - مامۆستا نۆشاد، دینەوەری

یەکێکێ کە، لەم ناودارە هەڵکەوتوو، بە ئەمەگانەی رۆڵە کوردە ئاری نەژادە ڕەسەنەکانمان، مامۆستا (نۆشادە) کە وەك ئەستێرەیەکی وورشەدار، جارێکی، تر ، لە ئاسمانِ چەرخی سیزدەهەمی کۆچی مانگی ناوچەی دینەوەردا، پرشنگی زانستی خۆی بە سەر ولاتا، بلاو، کردۆتەوەو، چیرۆکی (داری پیرەداری) کە بە راستی کەم کەس لە هونەرە پایە بەرزەکانی ولات توانیویانە، ئاوا، مامۆستایانەو، بە دەسەلاتو، ئاگاداریێیەوە، شەڕە، ڕابوردوەکانی، نەتەوە ئارییەکان، بە تایەبەت ئەوانەی لە شانامەکەی هونەری بە دەسەلاتو، هەمیشە زیندوی ئێران. واتە: فیردەوسی، دا هاتوون، بە ریك و پێکی و، بە زاراوەی (گۆران - هەورامی) بەلام، بە، کرو،رایەڵو، پۆی خۆڕەنگو، خۆماڵی، بهۆنێتەوەو، وەك وێنەگرێکی کارامەو، چازان، هەیکە لێکی ڕازاوە بو. سەرنجدانی ڕابوردوی لە مێژینەکانمان، بخاتە سەر، لاپەڕەی دڵی هەستیارانی ڕابوردو، ویستو، نەریتی خوشەویستەوە.

مامۆستا (نوشاد) لەم چیرۆکەدا، سەرە رای گێرانەوەی باری بەسەرهاتی ولات، هەر لە سەردەمی کۆنەوە، تا دەگاتە، سەردەمی نادرقولی (نادرشاه) ئەفشارو (شاطوماسبی صەفەوی) کوڕی شاسولطان حوسینی ئیصەفەهان، تابلۆیەکی، پڕ، لە ئازایەتیو، دەسکردنەو، بوێریش، سەبارەت بە راپەرین و، بەربەرەکانی کردن، دەگەڵ دوژمنو، نەیاری، داگیرکەریشا،نیشان نەتەوەزۆر لێ کراوەکانیش دەداو، رونی دەکاتەوە، کە بە چچەشنێك بە هۆی دوو، ملهوڕی وەك، (نادرشاو) (شاطوماسب) لە سەرکەڵەوەکێشی و، هۆملکێی خۆیان، ژیان و گیان و سامانو، داهاتی چینی بێ لایەنو، دورە بەشی ناوچە دورو، شاخاوێکانی، وەك

کوردستانیش، دەکەونە بە هێرش‌و، دەبنە دەستە چیلەی ئاگری خواست‌و، ویستی نارەوای ئەمان.

ئاشکرایە مامۆستا دینەوەری ، بەم کارەی، هەر ڕابوردو، سەردەمی کاتی خۆی ، نەخستوتە سەرقەوانی باسکردن‌و، گێرانەوەوە، بەڵکو، رابوردی کردوٚتە چوڵە چرای ڕێگەو، بە سەرهاتی تاریك‌و، تنوك و، ئەنگوستە چاوی داهاتوش. هەروەك دیتراوەو، بۆمان گێر دراوەتەوە دەزانین، هەر لە سەردەمی نادرشاوە، تا ئەم دواییانە، چۆن ولاتی ئێمە بوٚتە شەرگەی لاوەکی و، نامۆ، زۆردارەدا گیر کەرەکانی روژهەلات‌و، روٚژئاوای لەبەر چاو، کەوتوو،لی بیزراو، دزیوی گەلی کوردو، هەمو چینە بەش خوراو، ماف پیٚ شێل کراوەکانی سەرزەوی. بە واتایەکی، کە (داری جەنگیان، یان پیرەدار)ی مامۆستا نوشاد، هەر لە ئاوایی عبدالمحمّدو، (گوڵباغی) دینەوەردا، نەکەوتوٚتە بەر، ڕەهیڵەی‌تیری ژاراوی، نەیارانی ولاتەوە، بەلکو، لە هەموکەلێن‌و، قوژبنێکی نیشتمانەکەمانا، جەرگی بە دەیان داری تر بە تیری ساردەکەوانی دوژمنی ناوخۆو، دەرەوە، پێکراوەو، کون کون بۆوە.

جا، بەم پێیە، جارێکی کەش سوپاسیان لیٚ دەکەین و، لە بەرانبەر، راڤەو، هەستی خاوێن‌و، پاقژیاندا، سەری رێز، دا، دەنەوێنین‌و،کڕنوشی بۆدە بەین و، ئیکلامی دەکێشین.

بە گوێرەی نووسراوەکانی ژمیرە پنجی گۆڤاری (دەنگی گیتی تازە)و، لاپەڕە ٣٣٠ی بەرگی یەکەمی (مەشاهیری کورد) و، لاپەرەی ١٣٦ ی کتێبی (گوڵزار ئەدەبی لوڕستان) ئەم زاتە پیرۆزە، لە سەردەمی (نادرشای ئەفشار) دا [کە لە سالی ١١٠٠ هـ ق هاتوٚتە دونیاوە، لە ساڵی ١١٤٠ هـ ق دا، طەلعەت خاتونی کوردی قوچانی دە خوازیٚ، لە ساڵی ١١٤٥دا، لە (دەشتی موغان)دا. تاجی شایەتی لە سەر دەنیٚ و، لە ساڵی ١١٦٠ هـ ق دا، دەکوژریٚ ] ژیاوەو، ئەم چیٚروکە (داری پیرەدار)ی هۆنیوەتەوەو، باسی کە لەوە کیشی و، هوٚملکێی نادرشاو، شاطۆماسبی صەفەوییشی بەم دوو، هەڵبەستە ڕاگەیاندوە، کە دەڵیٚ:

ئێسته دەعوای دوخت، نادر، سوڵطانەن

عالەم، جە، جەورەش، بێزار، جەگیانەن

ڕەعییەت،فەرار،خەڵق‌خوڵقەش تـەنگەن

ئیقبــال ئـەولاد، (شـاەصەفی)لەنگـەن

ماموستا نوشاد، لە هوزی زەنگەنەی زورو، زەوەندەو، نـاوداری کـوردی نیشتە جێی ناوچەکانی دینەوەر، کرماشان، کەرکوك،و، تە نانەت ئەفغـانستان،و، خواف، و، شوینەکانی، کەن، کە لە ئاوایی (گوڵباغ)دا، هاتوتە دونیاوەو، پاشان، وەکوو هەموزاناکانی دیکەی وڵاتی کوردەواری، دەچێتەبەر خوێندن،و،دوای تەواو کردنی زانستەکانی ئەو، سەردەمە، دەبێتە ماموستای ئاواییەکی خوی (گوڵباغ) هەروەک ڕامان‌گەیاند،ئەم هونەرە بەهەستە، گەل و، نیشتمان ویستە، نەتیوانیوە، لە حاند ئەم‌گشتە زورو، ستەمەی سەردەمی خویدا، کە لە لایەن نادرقوڵیو، شای بنە چەك صەفەوی بەڕەسەن‌کوردی، تورك زمانی، خوبە عەرەب زانەوەکە، دەربارەی خەڵکی ئێران بە گشتی،و، کوردەکان بە تایەبەتی، بە ڕیوە دەبرا، بی دەنگ‌و، قوڕو، قەپ، دانیشی،و، زمانی هەڵبەست گرێداو، هیچ نە بـێژی،و، تەنـانەت تێشکـان،و، خونەگرتنی، شاطوماسبیش، پیش‌بینی نەکاو، نەڵی: : ئیقبال، ئەولاد شاە صەفی لە نگەن. هەڵبەت ئەم چەشنە هەستە، ئەرکی سەرشـانی هـەموو، هـونەریکی، بـەر پرسیاری خوداو، گـەل و نیشتمـانە، کـە دەبـی ئـەرکی خـوی، لە هـەرگێژاوەو، فەرتەنەیەکدا. ، بە زمانی هەڵبەست، بە جی، بینی. پیویستە ئەمەش بیژم، ماموستا غەضەنفەری ئەمرائی کە وەك باسمان کرد، لە لاپەرەی ١٣٦ ی «گوڵزاری ئەدەبی لوروستانا» دەربارەی ماموستا (نوشادە)وە دواون،و، هێندێکی‌تر، باری ژیـان،و، سەردەمی ئەمانیان بو ئێمە رونتر کردوتەوە، کە جـیگەی سوپـاسە،بـەلام چـەن خالێکی تێدایە، بونەوە، دەشێن، ئاماژەیان بو، بکەم و، پاشان. دەقی نووسراوەکە، بە کوردی خومالی دوپاتە کە مەوە.

## خاڵەکان:

١: لە جیاتی «داری جەنگیان» کە من لێکم داوەتەوەو، واتاکەییم، رون کردۆتەوە «لە پێشەکیەدا» نوسیویانە «داری جەنگە» دیارە ئەمەش واتا، دەدا، بەڵام ناگاتە واتای «داری جەنگیان» کە لە ساڵی ١٣١١ هـ ق دا، لە شاری کەرکوك نووسراوەتەوە:

٢: نوسیویانە: مامۆستا (نوشاد) خەڵکی ئاوایی «طەرهانە» دیارە ئەم ئاواییە ئێستا، سەر بە شاری پارێزگای «خورّەم ئاوا»ی لۆرستانەو، دەگەڵ ئاوایی «گوڵباغ»دا کە سەر بە ناوچەی دینەوەرە، یەکتر ناگرنەوەو، ماوەڵیان زۆرە

٣: نوسراوە، مامۆستا «نۆشاد» پێرەوی «سوڵطان سوهاکی» پێشەوای ئەهلی حەق بۆوە. بەلاّم ئەوە کە خودی مامۆستا نۆشاد، لە کۆتایی چیرۆکە، کەیدا. دەڵێ: (هەڵبەت لە زمان پیرەدارەکەوە) کە ئاشکرایە وەك من رون کردۆتەوە، ئەم پیرەدارەش لە ئاوایی «عبدالمحمّد»دا، هەڵکەوتۆدە [ئێستەش من پیرنیم خەیلێ جەوانەم- تازە وەتەمای مەهدی زەمانەم] ناکرێ پێرەوی پێشەوای ئەهلی حەق بووبێ، واتە ئەگەر، ئەم هەڵبەستە هی ئەوان بێو، نووسەرەوە خۆی لە ساڵی ١٣١١ هـ ق داکە ئەم چیرۆکەی نووسیوەتە، لێی زیاد، نەکرد بێ، ناتوانێ باوەری بە ئەهلی حەق بووبێ.

٤: مامۆستا ئەمرائی، باسی هوملکێی نادرشاو، شاطوماسبی نەکردۆوە، کە چۆن، بۆ، وە دەست هێنانی دۆتو، کەنیشکی خانی بە دەسەلاّتو، کوردی قوچانی، بە یەکەوە، کەوتبوونە، کە لەوە کێشیو، زۆرەملێو، مل ملانێوە.

٥: هێندیك لەم هەڵبەستانەی ئەمان هێناویانە، دەگەڵ ئەوەکانی مندا، جیاوازیان هەیە، کە بۆزور ترنیشان دانی، دەسەلاّتی مامۆستا نۆشاد، لە هەڵبەستا، لە ژیرەوەدا، لەگەڵ ئامازە کردن بۆ ئەم سرچاوەیە «گوڵزاری لورستان» هێناومن.

٦: چەن هەڵبەستێك، کە هەر لە نووسراوەکەی ئەمانا، بوو، ئەوانیشم، رەگەڵ ئەوەکانی خۆم خست:

## ئەمەش دەقی نووسراوەکەی مامۆستا ئەمرائی یە:

داری جەنگە: خوالّی خوشبوو، مامۆستا نوشاد، لە بنەماڵەی خێڵی أبوالوُفای «طەرهان»ییە، ئەم زانایە. کە بە زاراوەی لوڕی پیان گوتوّوە: نۆشای «بلەفا» یەکێك بوّوە لە پێرەوەناودارەکانی سوڵطان سوهاکی [1] پیشەوای ئەهلی حەق: مامۆستا نۆشاد. هەروەك لە کتێبە نووسراوەکانی دەردەکەویّ، لە سەردەمی نادرشای ئەفشار، دا ژیاوە: [2] نووسراوەکانی دیکەی مامۆستا نۆشاد، بریتین لە:
١: هیچو، پووچ ٢: بە همەنو، فەرا مەرز، کە نووسراوەی «داری جەنگە»و. هیچ و پوچ، بە زاراوەی کوردی «لەکی» و «بەهمەنو، فەرامەرز»یش، بە زمانی فارسین.
ئاشکرایە من «ئەمرائی» تەواوی هەڵبەستەکانی ئەم چیڕوکەم «داری جەنگە» لە پیرە پیاوانی ناوچەی لوڕستان، کە بۆ ئەم چەشنە بابەتانە نرخێکی باش، دادەنێن و، بە لای خۆیانەوە، ڕایان دەگرن و، بە جوانی دەیان پارێزن، وەرگرتوّوە.

ئەم چیڕوکە، فرە سەر سوڕ هێنەرو، بە کەلکەو، گەلێکیش، مەبەستی لیّ وەردەگیریّو، لە هەرە هۆنراوە بە ناوبانگەکانی ناوچەی لوڕستانەو، خەڵکەکەی، زۆری حەظ، لیّ دەکەن. ئەم زاتە «نوشاد» نەوەیەکیشی هەبوّوە، بە ناوی «نۆشادی دوهەم» کە ئەمیش، وەك باپیری خۆی مرخێکی زۆر جوانو، هەستێکی گەلێك خاوێن و، باشی، سەبارەت بە هەڵبەستو، گەلەکەی، هەبوّوە، بە پێی نوسراوەیەك، کە ئێستا لە بەر، دەستایە، ئەم نۆشادە لە لایەن «ناصرەدین شای قاجار»ەوە. زۆری ڕێز لیّ گیراوەو، تەنانەت سالأنەش ٣٠ تمەن (دراو-پولّ)ی بوّ براوەتەوە

---

١ دیارە من «داشبەندی» لە کوّتایی کتێبی «ئاداب و ڕسومی کوردان»دا بە درێژی باسی سوّلتان سوهاك و، ڕەووشتی ئەهلی حەق - گوران - علی‌اللّهی - و ئێزەدیم کردوّە.
٢ بەلأم من «داشبەندی» هەر، لەم دو هەڵبەستەی خۆی [ئێستە دەعوای دوخت...] ئەم مەبەستەم وەر گرت، دیارە ئاگاداری ئەم هوّملکییەی نادرشاو، شاطوماسیش بوومو، پاشان چیڕوکەکەشم بە ووردی و، سەرنجەوە گیراوەتەوە

لەدامێن و، پێیینی فەرمانەکەی شای قاجاردا، کە بە مۆرو، ئامازۆ (امضا)ی شا، ڕازاوەتەو، جێگری شکۆو، بارەگای شا «واتە: نائب‌السلطنة)و، صەدری ئەعظەمیش «واتە حەمزە میرزا» ساڵانە ١٥ تمەنیان بۆ، بڕی بۆوە [گوڵزاری ئەدەبی لورستان، لە ئەسفەندیار، غەضەنفەری ئەمرائی کۆهدەشتێ وە]
وەك بۆمان ڕون بۆتەوە، زاراوەی «گۆرانی - هەورامی» لە سەردەمی نادرشاەدا، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانا، زمانی وێژەیی بۆوەوە هەروەك زاراوەی کورمانجی ژورووی ئەمڕۆش لە بری «جە» هەر لە «ژ» کەلك وەرگیراوەو، لە بری «چوو، چووین»ی ئەمروش (شین و، شوون) واتە: ڕۆیشتن، دەکار هێندراوە جارێکی کەش ئەمەمان بۆ، رون دەکەنەوە، کە زمانی کوردی هەموی هەریەك بن چینەیان هەیە. (ئەورامی و،گۆرانی)

## زاراوەی ئەورامی و ، گۆرانی:

وەك ئێمە «محمّدپور» لە کتێبی «ڕێزمان و، خاڵدانانی زمانی کوردی» و، هەروەها، لە وێژرا «مەقالە»وەی «زمان لە باری کۆمەلایەتێوە»دا، باسی گەشەکردنی زمانی کوردی و، هۆی زاڵ بوونی، زاراوەیەك، لە زاراوەکانی زمانێك، کە چۆن، بە سەر ئەوانی کەدا، غەلەبە، پەیدا، دەکاو، پاش ماوەیەك، ئەوانی دیکە، ڕەبن دەخا. کردۆوە، ئەوەشمان ڕاگەیاندوە، کە ماوەیەك، زاراوەی «ئەورامی - گۆرانی» بە پێی هەل و، مەرجی ڕەخساوی ئەو سەردەمە، بۆتە زمانی وێژەیی و، هەڵبەست پێ هۆندنەوە، بە تایبەت لە سەردەمی والی یەکانی کوردستاندا. یان زاراوەی کوردی (لوڕی ) لە سەردەمی باباطاهیری عوریانا، یان زاراوەی کوردی کوڕمانجی ناوەندی، کە لە سەرەتای چەرخی نۆزدە هەمی زاییینێوە تا ئێستا. بۆتە زمانی پاراو، بەر بلاوی هەموناوچەو. هەرێمە کوردنیشنەکانی کوردستانی ئەو دیو (عێراق)و، تەنانەت، زۆربەی نوسەرەکانی کورمانجی ژوروش،وەهەر وەها، نووسەرە ئەورامانێکانیش بە تایبەت، پەخشان هەر بەم،زاراوەیە (کوڕمانجی ناوەندی)

دەنووسن، بە لاَم، بۆ پاراوو، تەسەلتر کردنی نـووسراوەکـانیان، دەست  دەبـەنە نێودەریـای زاراوەکـانی تـریش‌و، دوڕو، گـەوهەری ووشـەڕە سـەنەکـانیان لیٚ دەردەهێنن‌و، دەیانە خەنە، نێو، لێزگەی ووتەو، هەڵبەست‌و، ڕستەوە.

کاکڵەکەی ئەمەیە، هەرکاتیٚ زاراوەیەك، بە ناوی زمـانی، پـیٚ نـووسین‌و، وێژەو، ئەدەبی، نەتەوەیەکی فرە، زاراوە، ناسراو، خـوٚی سەقـام گـرتوو، کـردو، کتێب‌و، پەڕاو، ڕوٚژنامەی پیٚ نووسراو، ولاٚتەکانی دەرەوەش، ناسیان و، پێناسەی زمانی ئەونەتەوەیان، پێداو، موٚری ناسراویان، پێوەناە هەوڵو، تەقالاو، خوٚ، ماندو، کردن‌و، گەڕان، بەم لاو، لادا، بوٚکز کردنی، زاکون‌و، ڕێو،شوین‌و، تەنانەت، لە ناو، بـردنی ئـەو، زمـانە، کـە بـە هـەزاران کـتێب‌و، ڕوژنـامەی پـیٚ نـووسراوەو، لە کتێبخانەکانی دنیادا، تومار کراون‌ەکارێکی، باش نیٚ‌یەو،کات بە فێرو، دان و،کای کوٚن، بە باکردنەو کەتەپوو، توٚزەکەی، دەگـەڕێتەوە، نـاوخوٚو، سومـایی چـاوی هەموان، کز،دەکاە بەلاٚم ئەگەر، هەولْ بدریٚ بوٚ ئەوەی ، باری زاکون‌و، ووشـەو، ڕستەی، ئەو زمانە، جێگێرو، سەقام گرتوٚوە، دەوڵـە مـەند تـرو، بـە هـێزترکریٚ، ئەمەکارێکی، یەکجار، بەکەلك‌و، پڕ بایەخەو، ڕێزی، بوٚ،دا، دەندریٚ.

هیوایە، ئەم نووسەرو، کوٚڕو،کوٚمەلاٚنەی بە تەنگی ئەم کارەوەن، ئامانجیان، پێك هێنانی زمانی، ئەدەبی یەك گرتوو، دەوڵەمەند بیٚە ئەگێنـا هـەمووشەیەکـی خوٚماڵی، جوان‌و ژیکە لێەو، گشتیان، بە چاوی ڕێـزەوە ئـەشێی سـەیر کـرێن‌و، خوٚشەویست بن‌و، وەکو، گەوهەری شەو چرا، نرخیان بوٚ دانریٚ.

## زاراوەی ئەورامی ئەمڕوٚ:

ئەم زاراوەکەونارٚایەی زمانی کوردی، تا ئەو جێگایەی ئەزی ولات گەڕاو، خوٚ، بە خزمەت گوذار ، زانی نەتەوەو، گەل و نیشمان‌و، ئایینی پیروٚزی ئیسلام، و هوٚزەکەم، پیٚ دەزانم، زمانی وتووێژی ڕوٚژانەو، کەرەسەی، لێك حالیٚ بوونی، دو عیٚلی، گەورەی (لهوٚنی) ناوچەی ئـەورامـانی بـاشوری شـاری (کرمـاشان)و،

خێڵەکانی ئەورامانی ڕێژاو، و، ئەورامانی (تەخت) سەر، بە کوردستانو ، شاری (مەریوان)و، ئاوابیەکانی تەوێڵەو، باخەکۆنو، زۆربەی ئاوابیەکانی سەر بە شاری (هەڵەبجەی) هەڵچۆ قاو، جگەر، بژراوی کوردستانی ئەو دیو، هەروەها، عـێلی ناوداری (باجەلآن)و، هێندێك خەڵکی دەشتی (سەر پێلی زەهاو)و، دەرو، بەری شاری (خانەقین)و چەند ئـاوایـیەکـی، نـاوچەی گـۆرانـی کرمـاشان،و، گشت دانیشتوانی، شارۆلکەی (کەندوڵە)ی دینەوەرە.

ئەورامانی باشور، کە بە جێگەی سەرلیْ هەڵی نانی سوڵتان سهاك (أسحاق) دامـەزرێنەری (ڕەووشـتی ئـەهلی حـەق) دانـراوە دیـارە مـن دەربـارەی ئـەم رەووشتەو، هەروەها، ڕووشتەکانی تری ناو، کـوردەواری، لە کـتێبی «ئـاداب و، ڕسومی کوردان»دا. دوام‌و، دەتواندری تەماشای کریْ، لە سەر فەرمانی سوڵطان سوهاك، ڕێ و شوێنی ئـەو، ڕەووشـتە بـەزاراوەی کـوردی ئـەورامـی، بـە نـێو پێرەوەکانیدا ، بلاو، دەکرێتەوە، کە ئێستاش، ئەم یاسایە، هەر بە کوردی بەرێوە دەچیْ.

بە تایەبەت لە چەرخی هەشتەمی کۆچی مانگی دا، تـا دەگـاتە سـەردەمی شـاە اسماعیل صەفەوی، پرۆ، پاگەندە کردن، بۆ ئـەم رەووشـتە. هـەمو نـاوچەکـانی رۆژئاوای ئـێرانو، تەنـانەت (لوڕسـتـان) و (ئـاذەربایجان) یشـی، گـرتبۆوەو، ئێستاش ئەم ڕەووشتە، لە شارەکانی ئاذەربایجانو، دەورو،بەریاندا، دەبیندریْ [ وەك ئوسکۆ، میاندوئاو، ماکۆو، هیتر] لە ئاکامی پەرەسەندنەی رەووشتی ئەهلی حەقدا، زاراوەی ئەورامیش، کە ببوۆە، زمانی ئایینی خاوەن رەووشتەکە، پەرەی سەندو، گشت ناوچەکانی گرتەوەو، هۆنەرە کوردەکانیش، وێـرای خـەڵکە کـە، هۆنراوەکانی خۆیان، بەم زاراوەیە، دەهۆندەوە، دیارە درێژەی، ئـەم مـەبەستە لە سـەردەمی صەفەوێکـانو، والـیـانی کوردستـانیشا، هـەر هـەبوو، تەنـانەت لەو سەردەمەدا، گەلێك لە هۆنەرانی کورمانجی ناوەندی ئەمرۆش، تاکۆتایی چەرخی سێزدەهەم، بـەم زاراوەیـە، هەلبەستیـان دانـاوەو، هـەڵبەستە خـوانـاسانەکـانو، ئەوێنیەکانی خۆیان پیْ هۆندۆتەوە:

زازاوەی (ئەورامی) لەگەڵ (گۆرانی) دا، کە پتر، لە ناوچەی گۆرانی سەر بە (کرماشان) ڕمێنی هەیە. فرە لێکەوە نزیکن‌و، لە بنە ڕەتا هەریەکن‌و، لە یەکتر جیا نەبون‌و، نین.

زاراوەکانی، زازا (کورمانجی باکوری) و (گۆرانی) دەگەڵ زاراوەکانی ناوەندی ئێران (سەمنان) و، (مازەندەران) و (گیلان)دا، زۆرویێك دەچن ولێك نزیکن‌و، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، کە زمانە ئاریایەکان، بە تایەبەت هی ئێرانی ئەمرۆ، هەر یەك بوون‌و، ئەم زمانە هەر زمانی سەردەمی (ماد)و، ئاوێستایەو، زاکونی زمانەکەش هەر خۆماڵییەو، بێگانە بۆیان بە دیاری نەهێناوین‌و، لەم بارەوە، سواڵمان لە خەڵك نەکردوە: [1] بە هیوای سەرکەوتن‌و، ڕزگاری هەمو، گەلانی بن دەستی ولاتە چەوساوەکانی گێتیو، پێك هێنانی زمانێکی یەك گرتووی خۆماڵی:

## هەر خۆش و، سەرکەوتوو بن:

*عەزیز- محمدپور- داشبەندی*

**تاران- ١٧ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٨ هەتاوی:**

---

١ هەڵبەت ئەزی هەڵوەدای زمان‌و، کەلە پورو، نەرێتیو سە بە هوردو ، زمانەکەی خۆمە لە سەرەتای کتێبی: (ڕێزمان‌و، خاڵ دانانی زمانی کوردی) بابەتی ئەوە کە ئێمەی کورد، نەتەوەی مادین‌و، ئاویستاش هەر، بە زمانی (ماد) بۆوەو، زەدوشت) پێغەمبەریش هەر لە ئێمە بۆوەو، زاینگەکەشی ولاتەکەی خۆمان بۆوە بە درێژی دووام. جا، کەی چاپ دەکرێ خودا، دەزانێ

# چیروٚکی داری جەنگیان

## مەشهور بە «داری پیرەدار»

دانراوی ماموٚستا «نوٚشادی دینەوەری»

پیٚشەکی، دوٚزینەوەی - جیٚگاو، ناوەکان
نوسینەوە، و ، فەرهەنگوٚکەی
«هەورامی» و «سوٚرانی»

له: عزیز محمدپور «داشبندیٚ»وه

# چیرۆکی: (داری جەنگیان)

## مەشهورو: بە داری پیرەدار

## دانراوی: مامۆستا نۆشادی دینەوەری

هــامسەران وەخــتێ ، هــام‌سەران،وەخــتێ[1]
جــە،رۆیــان، ڕۆیــە، جــە، وەختــان،وەخــتێ[2]
چون (قەیس،) پۆشاییم، جە،(کەڵبوس ) ڕەختێ
ڕاگــەم، کــەفت، وەپــای، عــالی درەخــتێ[3]
ســەر،نــە، کەهکەشــان، فــەڵەك، بــەردە،بــی[4]
پــا،مــوحکەم، نــەقەعر، زەمــین، کــەردەبی

---

١ لە نوسراوەکەی غەضەنفەریدا، هامدلان، هاتووە
٢ لە-ن-غ،دا، لە جیاتی، جە،ژە، هاتووە
٣ ل - ن - غ،دا (چی) هاتووە، دیارە چی، چین‌چووین، لوڕین‌و، هەر، واتـای چـون،واتـە، وەك، ئەدەن:
٤ ل-ن - غ (وی) هاتووە:

شاتا، بی، شاخەی، شاخی، لك، نە، دور[1]
پەری نیشنگای پیرو، بوڕناو، بور

جادەی رەگوذار، هەر، حەق شناس، بی[2]
خونە كتوجە، بێخ، (طوبا)، سایەش، بی

هەوای فەرەح بەخش، عەجیب، پایەشەن
جای میرو، بێگلەر، جە،سای، سایەشەن

مەزەش ، شادی وەخش، هەواش، موعتەدیل
درەختان، جە، بیم، بڵەندیش، خەجیل

هەروەخت، سەیر، مەكرد، طەیرێ، جە، طەیران
مەنیشت جە، شاخەش، پەی، عەزمی سەیران

دیم، نە،روی سینەش، زامی تیرگازێ
یادگاری شەش صەت، خەدەنگ ئەندازێ[3]

چون، جای قوڵەنگ گاز، (فەرهاد)، أِظهار،بی
جەو،لاوە سوهای، خوڕ، لێش، دیار،بی[4]

ئامام، تەك، دام، مەن،وەو، دارەوە
وەو،داری زەدەی، ڕەنج، ڕۆزگارەوە[5]

دارێ، بی، ریضوان، بەرگو، بارەوە
مەنەی، پەی، میحنەت، ڕوزگارەوە

---

١ ل - ن - غ - ئەم هەڵبەستە بەم جۆرە، هاتۆوە (شاناوی، شاخە، شاخو، بەرگ، وە دویر: پەیی نشینگای ، سەیر، بۆرناو، پیر)
٢ ل - ن - غ - (ڕاگەی، ڕاگوذەر، خەڵق، نە پایەش بی: خوونە كتر، ژە، سای طوبا، سایەش، بی)
٣ ل - ن - غ: لە جیاتی، شەش صەت، واتە: شەش، ڕا، صەد، شەست، واتە قامكی شادەو، پەلە پیتكە، هاتوۆە:
٤ ل - ن - غ - هور، كە هەر واتای خۆر، ئەدا، هاتۆوە:
٥ ل - ن - غ - تیری خارەوە، هاتووە

مـــولا حــەظەی زام، تیرگــازەش، کــەردەم
دیویــا، چــون (دیـو)ی (دەمـاوەند)، دەر،دەم[1]

بـــڵێزەم، بــەزر، بــی، ئــەندوم، بــیّ پــایان
عەسرین،جە،دیدەم،سەیل،وەست، وە، دامـان

پرســام، ئــەی، درەخت بــەرزیبەهرە مەن[2]
کەس، نـەزان، تـاریخ ،سـەنەی سـاڵت، چـەن

جەعومرەت چەندساڵ،چەندوەقت وێیەردەن؟
کێ تۆ،دەست نیشان،ئەی دییـار، کـەردەن؟[3]

کـــیّ، جـــە، وەرینـــان،ووریـــنت،دیـیەن؟
کێ، جـە، سـەر،داران، جـەی، ڕاگـە،شـییەن؟

ڕەزمــــیّ، بەیـــان، کــەر، جـــە، ڕۆژگـــاران
چـــەطور، سـەردو، گـەرم، دەهـرت، وەیـاران

ئــەی زامـــە، چــێشەن، بــەدەرو نــی تــون
کـام سـەرهەنگ داخـڵ وەیـەن، هونیتۆن؟

دیـــم، دەنگـــیّ ئـــاما، جـــە، تـــۆی، دارەوە
جـــــەو، داری زەدەی تـــــیر، خـــــووارەوە[4]

بـــە، زەکـــارەوە، وات، ئـــەی دیـــوانـــە[5]
چـــون مـــن، دێــر مـــاوای، بیـــابان، یـــانە

ئــی وَصْــفُ اَلحــالُه، مــە،پــرسی، چــەنەم
مــە،نمـــانی ئـــاداب، ڕەستـــاخیز، پــەنەم

١ ل - ن - غ - دویاوە، چون، دوید، (واتە، لە ناکاو، دوکەڵی هەناسەم، وەك دودو، تەمی کێوی، دەماوەند، بەرزەوە، بوو) هاتووە:
٢ ل - ن - غ - (واتیم، هاتووە:
٣ ل - ن - غ - وای، واتەوە ئی دیارە، ئەم ولاتە: هاتووە
٤ ل - ن - غ - فەڕتوت، میحنەت بارەوە، هاتووە:
٥ (وەزار، زارەوە) هاتووە:زەکار، واتە: سکالاو، گلەیی

مــــەکـــــولونی، زام، وەنـــاسۆر، کـــەفتەم
مەشکافیی، یـەخەی، جـامەی خـەم، بـەفتەم
ئــەگــەر، بەیـــان کـەم، شـەمەّی جـە دەردەم
عەرض کەردەن ئـەحوالْ، هەنـاسەی سـەردەم
ســـالْی وە پــەنیْ نــەمە، شـــوْن، جـــە وەر[1]
تـوْ، نـازوك طـەبعی، مـە ڕەنـجوْت، خـەطەر
سـاکـە، چـووین، ئـاتوْ، مـەیلت، ئـەحوالْـەن
ئـــــارەزوت، خــــەبەر، دیْــــرینە، ســـــالْەن
تـــاکـــە، نیشـــتەنـی، گـوْیْ دەر، وە، دەنگـــم
تــــا واچـــــوْم، ئــەحوالْ، ستـــارەی لەنگـــم
نەمـــام، بـــیم جـــە دەور، (کــەیومەرثی کـەی)
ڕوْژ بـــە ڕوْژ ئـــامام، کـــەفتم، وەی، بـــەوەی
جـــــەنگی (سیـــامەك، دیْـــوان،)م دیـــــیەن
(هــوْشەنگ) بـە وسـامو، بـەو سوپـام، دیـیەن
(طـــەهمورث)پـــاشای، هـــوْشەنگم، دیـــیەن
ئەو صەف ئاڕای تیپ، ئـەو، جـەنگم، دیـیەن
شـاهی (ئـەطروْط) شـای سـەرهەنگم ، دیـیەن
گوڕزی، نـوْ، صـەد مـەن، کـوْ، ڕەنگـم دییەن
بەزمی (جەمشید) شـای، جـەم، بـەندم دیـیەن
ئـــەو، ڕامـــیشگەران، زار، قـــەندم، دیـــیەن
کـوکەبەی (ضوحـاك) مـەرد، ئـەسپم، دیـیەن
دەست بـــەندو، بـازوی، (گوْشـاسپم) دیـیەن

---

١ لە، نووسراوەکەی ن ـ غ دا، ئەم سێی هەڵبەستە بەم جۆرەن: یە، ساڵ و ، نیمی، نەمە، چوو، ژە، وەر ـ تۆ نازوك، طەبعی مەرەنجو، خەطەر ـ بە لێ ، چۆینا توو (چوین، ئاتو) مـەیلەت وە حـاڵەن ـ مەقصودەت حەساو، ویردە، ساڵەن ـ هەرتا، نیشتینە، گۆش، دەر، وەدنگەم ـ تا، وا چۆم حالات....

جەفتی، مار، نەدووش، ضوحاکم، دییەن

جا، بوسەی، شەیطان، ناپاکم، دییەن

(فەرەیدون) ئەو (بێخ)، بونیادم ، دییەن

عەلەمی (کاوەی حەدّاد)م دییەن

(سەلم و طور، ئیرە ج، پەشەنگم،) دییەن

قەهری (مەنوچهر)، ڕۆی جەنگم ، دییەن

نازی کەی نەواز (شەهزاد)م دییەن

(قوباد)و (قارن، کەش واد)م دییەن

(سامی نەریمان) سوارم، دییەن

بەلکە، بەی وێنە، هەزارم دییەن

(ذاڵی پوری سام) دێو، بەندم، دییەن

جە، ذاڵ زیادتر، من چەندم، دییەن

شاهی (کەی قوباد) زەڕ، بەخشم، دییەن

(ڕۆستەمی) زوّر،موشت،وە،(ڕەخش)م دییەن

شای (ئافراسیاب)، غەضەب خووم ، دییەن

(هوّمان و، پیران)، جەنگ جووم، دییەن

توندی طەبیەت (کاووس)م، دییەن

ظەریفی زەرد، ئەسب (بن طوس،)م دییەن

(برزو، سیاوەش، سوهراب)م، دییەن

سورخەی پیلْ سومی ، تەژاوم دییەن

(فەرامرز)ی یەل، وە، یالّم ، دییەن

ئەو، ڕانو، ریگاب، گوّپالّم دییەن

(برزو)ی بەر، زیگەر، ئەو پیلم دییەن

(ڕوستەمی یەکدەست) نەو فیلم دییەن

(کەی) و، (فەری بورز زەوار)م دیەن
(بەهرام)و، (بیژەن) خون خوارمدیەن
هفتادو، هەفت کوڕ (گودەرز)م دیەن
صاحەبی هەر مەرز، هەر، بومم، دیەن
شاهی (کەی خوسرەو) دیندارم دیەن
ئەوجوقە، ئەو تاج طومارم دیەن
کەی نیشنی ئەسب (گوشاپ)م دیەن[1]
دانش‌و، حیکمەت (جاماسب)م دیەن
سوپای (ئەسکەندەر) هەم (دارا)م دیەن
سوپای جەیحون ڕەنگ (بوخارا)م دیەن
(ئەسفەندیار)م ، بەو، جەوشەن دیەن
نەبەردی، نەبەرد، (تەهیمتەن) دیەن
بیٚ عەدلی (بەهمەن) ، بیٚدینم، دیەن
دوایی بەزم‌و، ڕەزم، پرٚقینم دیەن
ڕەزمی (ئەردەشیٚر) ئەولادی (ساسان)
شای (ئەردەوان) بی، جەورا، (هەراسان)
سوپای (ئەسکەندەر،) (دارای) بن دارا
یەك یەك وە قوٚشەن، جە، لام مەویٚرا
(شاپور) شاپوران، پیلی دوشمەن بەند[2]
(هوٚرمز هوٚرمزان، ماچین)، مەل خەڵەند
(قوباد، قوبادان ئەردەشیران) گشت
(بەهرام) بەهرامان، گوٚڕ، ئەفگەن، وە، مشت

١ لە بری، ئەم کوتە، لە نوسراوەکەی (غ)دا (کەی نشین کەنیشت، لوٚهراسبم دیەن) هاتوٚوە.
٢ ل - ن - غ -دا، ئاوا، هاتوٚوە: شیٚری، شیٚر، ئەوژەن: هورمز، هوٚرمزان: گەی، جە، دوژمن ،سەن:

عــەدلی (نـۆشیروان،) ئــەقل (بـوذەر جـومیر)
چـــەنی بــەد، بــەختی، (بــەختەکــی) وەزیــر
ســـوپەر، ســـەرو، تــاج، (پـــەوێز)م کـــەردەن
تەمـــاشای (شـیرین، شـەو، دێـز)م کـــەردەن
مەصــــافی (بـــەهرام چـــوبین)م، دیـــیەن
ئـــەو، گـــورزو، گۆپـــالْ (روبــین)م دیـــیەن
تا، بە عـەهدی عـەصر، (شێرۆ)ی سـتەم گـەر
پدەر، کوشتە کـەرد، نـیشت، وە، جـای پـدەر
دەر، ســاعەت ئـاواز، بـەد، عـەهدیش، خـێزا
ســەرداران جــە، لاش یــەك یــەك، گـــورێزا
شــــاهیش، نــــەکێشــــا،وەنـــیمە، مـــاهی
هــەرجــا، گــەدایــەك، بـی، وەیـەك، شـاهی
دونیــا، پــڕ ئــاشوب جەهـان، بـەرهەم، بی
خـــاطران، نــاجەمع،ئـاسایش، کـــەم، بـــی
هـــەر، دێ نـــیشنێ، کـــەی نـــیشنێ بـــی
هــەر یـــەکــە، سـەردار، سـەر، زەمـینێ بـی
نــە، هــەر، جــانبێ، خــێزا، ســەر، هـەنگێ
نـــە،هـــەر، ولاّتـــێ،پـەیدا بـــی، جـــەنگێ
تــۆمەز، سەرهەنگـــان، داواشـــان، واســـتەن[1]
هـــەر، ئـــاواتشـــان، جـە، خـودا، خـۆاسـتەن
ئـــێلچی، نـــامەشان، ئـــاوەردەن، بـــردەن
وادەی، جەنگشـــان، نـە، پـای ، مـن، کـردەن

---

١ ل - ن - غ - دا، بەم جۆرەیە: تۆمەز، دوو، سەرهەنگ،دا واشان بەستەن:

هــەر، ئەوســام، زانــا، تـیپی جـەنگ خـێزا[1]
بــانگی ســەرداران,ڕۆی جــەنگ، هــوریێزا[2]
پــەیدا بــی عــەلەم،جــە جـەنگ، ئـازمایان
دو، صــەف پــەیدا، بــی، نـەداشـتەن، پـایان
ئــامان، ڕو، وەروم، دوسوپــای عــەظیم[3]
من، جەی بـڵەندی، بـە سـەخت چـارە بـیم[4]
دەلێــران داوا، غــەرقی پــۆلاو، بــەرگ[5]
ئارەزو، بـە جـەنگ، بـیٚ خـەبەر، جـە،مـەرگ
دەست گرتن، وە، سەیف، داخلْ بین وە هـەم
داشــان ، بــە، هــەمدا، بی، وە، تـۆزو، تـەم
شــێری سەهمنــاك،پـا نەشنـاس جـە، سـەر
تــەهمیتەن، هــەیوەت دەس، و ەشــیر بــەر
وێنەی بـەرقی ڕەعـد، هـەم طوفـانی سـەخت
مــەوارا، تـەگـەرگ، بیسـامان، بـە، جـەخت
هــەوا، پــڕ غوبــار، زەمــین، مـەوجی هـون
ئـەسبو، مـەرد، وەبـان، هـەمدا، سـەرنیگون
لاشــەی ســەرداران، لە مــەیدان کــوێی:
هەرجـا هـون جـاری،چـون، ئـاوی جـۆ،بـی
دیــم پــەهڵەوانــیٚ، ویــنەی تــەهیمتەن
کەڵەی دێو، نە، فەرق، پۆستی بەور، جـەوشەن

١ ل - ن - غ - دا، لە بری تیپی جەنگ، طەوولی جەنگ، واتە، تەپلی شەڕ هاتووە:
٢ لەبەری، بانگی ڕەعدئاسا، هەر جادەنگی ووریزا
٣ ل - ن - غ - دا، روو،وە روو، ئامان، هاتووە:
٤ من، مەنمە، مابەین، میحنەت زدەی شوویم، هاتووە
٥ لەبری ئەمە، ئاوا، هاتووە: بەوری، پۆلاد،

مـــوزەصّەع تـــاجیٚ‌نیـــابی، نـــە ،ســـەر

زریٚـــەی، کـــەی قوبـــای ، کـردەبی، نـە، وەر

نە، پشتی ئـەسپی، سـەنگین تـر، نـە، ڕەخش

سینەو، دوم، تەمام، ئەعضاش گشت، دڵ کەش

نە، مەعرەکەی حـەڕب، نـەزدیك، بـی، وەلام

جـە،نـەوەی شـاهان، (ئـەردەشیٚر) بـی، نـام

فـــاقەی خـــەدەنگی، نـــە، چولّەیِ کـــەوان

پۆست کـون، کـەردەبی، چـون (ذاڵـی) زەمـان

ئـــاما، ڕوبـــەڕوی ســـەرداری ئـەم ســەر

ســـەرداری ســـەنگین، لیٚش، کـردن حـەذەر[1]

چون (شوغاڵ) نە، زۆر، سەر پەنجەی (رۆستەم)

ئـــاما،نـە، پـای مـن، نـەشی کـرد،وەچـەشم[2]

دیـم خـیٚزا، شـاخەی، خـەدەنگی گـوڵ، زەر[3]

فـــڕەی ســـەر، کـــوزە، مەشکـــا، داڵ، پـــەر

سینەم، ئاماج کرد، سـەر، مـەودای خـەدەنگ:

دوزیـــام، وەســـینەی، سـەرداری سـەرهەنگ:

جـــە مـــن، گـــوذەر کـرد، جـە، ئـەو، وەیـارا،

تـــا، پـــەڕنیشت نـــە، خـاك، نەمنـاکـی سـارا

سەردار، کەفت نـە، خـاك، مـن، مـام، وەپـاوە

وەزامـــــی، خـــــەطەر، نـــــاسۆر، نومـــاوە

---

١ لەبری ئەم نیوە لەتە، ل ن - غ دا، ئاواهاتووە
سەدار، سەهمناك، لیٚش کردی، گوذەر:

٢ ل - ن - غ - دا، ئاوا، هاتووە: وە پەیواری من، سەنگەر کرد، موحکەم:نەشتی کـردوە چـەشم (نیشتە چەشمی من)

٣ دیم خیٚزا، شاقەی کەمانی جەئیوەر - جەفیڕەی تیرەش هۆش مەشی جەسەر (ن)

ئەوســا، جـەنگی تـیپ، کێشـاشان، نـە،سـەر
مەردانـی داو، خــواز: دەعـوای مـەردیگەر
جەو، سەر ، جە، ترکەش، وەی سەوار، کـاران
مـــەویرا، بـــەر، پشت، تــیرٶوێنەی، واران
جـــەنگی سـەرداران، مـەردان شـین، وەسـەر:
شـێران، خـونخوار، مـەردان، جـەکـۆو، بـەر:
دەس بـردن، وەسـەیف، چڕژیــان، وەهـەم:
داشـــان وە هـــەمدا، وێــنەی تــۆزو، تــەم:
چـەکـاچەکـی، تـیغ، مـیصری زریٚ بـڕ:
خــوریشت سوپـاسان، مـاوەردی، وەفــەڕ:
بــەس، کــاسەی، کەڵە، نـە، مـەیدان، کـۆبی:
لاشەو،گوشتو، پۆس، خوناو، چوین، جۆ،بی:
وەبــانی هـەمدا، لاشــەی ئـەسبو، مــەرد
کـەفتە بـی، نــە خـاك،مـەعرەکـەی، نـەبرد
تـوڕبەی سـەر، نـە خـاك ڕۆی مـەیدان کـۆبی
لاشەی ئەسبو، مەرد، هووناو، چون، جـۆبی
شـیو،ئـاما، دوتـیپ، جیـا بـین جـە،هـەم
مـن مـام، بـەی گشت داخ،دەردو، ئـەندوەغەم
سـەحەر، داڵ، کێشـان شـەهیدانـی جـەنگ
زەردبی، جە، ئەوەڵ، قـورصی ئـافتاب، ڕەنگ
وەحش‌و، طەیر، جەکۆە، وێشـە، سـەر کـردن:
لاشـەو، جـەرگ‌و، بـەرگ،شـەهیدان، هـوردن:
هـەر، دەم، وەنـەوبەت طـەیری، جـە طـەیران:
مەنیشت وەشـاخەم، پـەی، عـەزمی سـەیران:

هەر، کەسێ داو خوآز، مەردی صەد،کەس بی
لاشـەش، وەخـوراك، هـەزار، کـەرگەس بـی
شـاقەی مـەل، وەبـان، لاشـەی غـەرقی هـون
مـەنیشت وە سـەرای تـاقی (بـێستون)
گـا، سـەیری لاشـە، گـاه تەمەنّـای چـوڵ
گـاهگاه، وە تیمـار، پـەرو، بـاڵ مـەشغوڵ
ئـەوان، هـەریەکـێ،بـە مـاوای ویشـان
مـن خـەجڵمەندەم، مـامەوە، جێشـان
بـەی زامـی خـەطەر، بـەی، سـامانەوە
سـالآن، پـام پیچـان، وە، دامـانەوە[1]
جەو، دوما، چەند، شاە، چـەند گـەدام دییەن
چـەند کـوچی خـیلآت، گـوذەر گـام دییەن
چـەند پـێغەمبەران چـەندی ئیمامان
ئـەگـەر، بـوا چـون، نـەدارو، سـامان
چـەن تـیپ،چـەن سوپـای، شـاهانم دییەن
چـەن بـێگ لەر، بـەگـی، بەیـانم دییەن
چەن بەگ، چەن بێگلەر، چـەن مـیریم دییەن
چـەن شـێخ، چـەن مـەلآ، چـەن پـیرم دییەن
ئـیستە دەعـوای (دوخت ، نادر، سولطـانەن)[2]
عـالەم، جـە جـەورەش بـێزار، جـەگیـانەن
رعـیێەت فـەرار، خـەڵق خـولقەش تـەنگەن
اقبـاڵ ئـەولاد (شـاصەفی) لەنگـەن

١ ل - ن - غ - ئاوا هاتوە: هێملن، هام، وەبا، وەی سامانەوە:
٢ تا، ئەیسا، یەدەور، نادر سوڵطانەن - مەردوم، جە، جەورەش...

ئیسگه، مـن، یـه، حـاڵ، یـه ئـهحوالمـهن
یـه، ڕهنـج بـردهی،چـهندین سـاڵمهن
جههـان، ئـاشووبه، دونیـا دهرهـمه:
خـاطر- حـهزینه، ئـاسایش کـهمه:
ئـهیسهش مـن پیرنیم، خـهیلی جـهوانـهم[1]
تـازه وه، تهمـای (مـههدی) زهمـانهم
فـریٚ مـهترسوٚن جـه، ئـیٚ ڕوٚزگـاره
جهی دهوری بـهد، عـهکس،میحنهت گـوذاره
نـهوا، بـهد، بـهختیٚ پـیٚم دهروٚ، ئـاهیر[2]
بسـڵیسهم، بسـهرزبوو، بـه، ئـاهری بـاهیر
بکـهوتم، نـهڕوی خـاك پـهست زهمـین بـام
کـهس نـهبو، تـوڵیٚ، بسنیژوٚ، نـه، جـام
هـالاٚ، کـه، ئـاخر، وه، یـهردوٚ، فـامهن[3]
چـهن سـاڵهن، کـه «دار جهنگیـان» نـامهن
نوٚشـاد: ئهمـانهن، ویٚت مـهدهر، نـه،غـهم[4]
پـهی جـیفهی دونیـا، زیـادبو، یـا، کـهم

---

١ واته، له گهڵ ئهوه شاێتهمهنم له تهمهنی کهیومهرث و، باوکه ئادهمیش دریژتره، بهلاٚم خوٚم به لاو، دهزانم و، چاوهڕوانم مههدی زهمانیش بیٚ و، له بن سایهی منا شهڕ بکا:
٢ ل ن - غ دا، ئاوا، هاتوٚوه: لیم بدهی ئاگر - سوختهم، باد، بهریٚ بایهر، وه بایهر
٣ کوٚتا بوو، نهروی زهمین، خاك پام - کهس نهی، نا، تویٚلیٚ بنیشوٚ، نه جام:
٤ سهرهڕای ههموو، بهڵگهکانی رابوردو، بوٚ ئهمه که ئهم چیروٚکه، هی ماموٚستا نوٚشاد، دینهوهری یهو، مافی کهسیٚکی کهی بهسهرهوه نییه، ئهم ههڵبهسته به تهنیایی، هاوارده کا، ئهم پیرهداره له ناوچهی دینهوهردا بوٚوه، واته: (ئاوایی عبدالمحمّد) نهك شوٚێنیکی کهی وهك [ بان هوٚبهتوی دیواندهرهی کوردستان [ قاپلانتو ] که وابوو، ئهم چیروٚکهی، برای تیکوشهرو، بهڕیٚزم، کاك ڕهشید، (کهی خوسرهویی) له بهرگی دوههمی لاپهڕهی ٢٠٦ تا ٢٤٠ کتیٚبی «دهورانی بی خهبهری»دا، داویانهته، پال «میرزا، شهفیع» پاوهییهوهوهو، جیگه کهشیان، به «بان هوٚبهتو» داوهته قه لهم،له گهڵ ئهوهش دا زوٚربهی ههڵبهستهکانی ههر ئهم ههلبهستانهی ماموٚستا نوٚشادنه بهلاٚم، به پیٚی زاراوهی ناوچهیی ئالوٚ، گوٚریٚکیان به سردا، هاتووهو، کهم و، کوڕیو، ناریٚکیشیان تیٚدا، به دی هاتوٚوه،ده گهڵ ئهم چیروٚك و، پیره دارهدا،

دونیـــا، بـــێ وەرەن، ئـــەصلەش، بەربـــادەن:
ئـــەولە، کـــەسیگە، وەی بـــادە، شـــادەن:
ئـــەرگەنجت پـــڕبوو، وێـــنەی سـەلمو، تـــوور
گـــیز،مـــاڵو، ســـامان، مـــەوەردی وەگـــوورژ:
ئـــەندەرزم یـــەسە، پـــەی دونیـــا دوســـان:
دونیـــا دەمـــێکەە، چـــون، شـــارو، بۆوســـان:
دەوران، مـــەویردۆ، وێـــنەی چـــەرخـــی طـــور
کـــەس مـــاڵی دونیـــا، نـــەبردەن وەگـــور

تمّت شده ۲۰/ رمضان آلمبارك ۱۳۱۱
یونت ایل = کذا. أصله

له سەردەمی نادرشای ئەفشاردا. داندراوە (مەلاعەزیز)

من: مەلا عەزیز داشبەندی ئەم چیرۆکەم، لە بەر نوسراوەی
میرزا عەزیزی بۆکانی کە لە سالی ۱۳۱۱ی هـق
نوسرا بۆوە نوسیۆوە ۱۴۰۹ هـق تاران

---

یەك ناگرنەوە،دیارە بەم واتایەش نییە، کە ناکرێ میرزا شفیع چوییتە [بان هۆبەتوو] و هەڵبەستی بۆ ئەم [تاقە دارە پیرە] هۆنیێتەوە، بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە هەڵبەستەکانی میرزا شەفیع ئەمانە هەمویان نین، چونکو زۆربەیان، هی مامۆستا نوشادن بەم هیوایە، ئەمانیشمان بە تەواوەتی دەس کەوێ. ع-م-د:

# کەڵەوەکێشی و، بەربەرەکانی نادر قوڵیو، شاطوماسبی صەفەوی، بۆ خواستنی کچی (سام بەگی زەعفەرانلوی) کوردی قۆچان

وەك لە پێش دا، باسمان، کرد، نادر قولی، بە هەمو، هێزو، توانایەوە، هەوڵی دەدا، کچی سام بەگ، بخوازێ، بۆ ئەوەی، ئەم خزمایەتیێ بکـاتە، هـۆی هـێزو پشتیوانیو، پلەی سەر کەوتنی خۆی و، بێ هـێزو، لاواز کـردنی، شـاطۆماسبی صەفەوی و، هەمو نەیارەکانی تری، بە لاّم سام بەگو، بە تایەبەت حەمە حوسین خانی کوڕی پیێ را، نەدەهاتن بە هیچ چەشنێ خزمایەتی دەگەڵ نـادر قـولی دا بگرنو، کچی بدەنیێ، کەچی بە هۆی هـەڵو، مـەرجـی هـەڵ کـەوتو، کـوشتنی نەجەفقوڵی کوڕی سام بەگ بە دەستی شاطۆماسب، بۆ، نادر قولی، رەخسا بەڵێن لە سام بەگ وەر گریێ ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە، شاطوماسب بە هۆی باسو، خوازو، تاریفی جوانی و، هەڵ کەوتویی (طەلعەتی) کـچی، سـام بـەگ ئاراوو، قاراوی لی هەڵگیرابووە دەیەویست، بە هەر جۆرێك بیێ، دەبیێ ببێتە زاوای

سام بەگ، دیارە (شاویردیخانی) شێخوانلوی کوردیش، کە یەکێك بو لە هەرە دوژمنە، توندەکانی، نادر، لەم گێرەو، کێشەیەدا، نەخشێکی گرینگی هەبوە شاطوماسبی لە خوڕازی و، مل هوریش. بە بی بیر کردنەوەو، دەبەر چاو گرتنی هەلو، مەرجی کاتیو، هێزو، توانای نادرو، نەیاری زوربەی کوردەکان، شایی دە، دلدا، دەگەڕاو، تاقمێکی لە، گەورە پیاوانو، کار بە دەستانی میریو، دەرباری، نادرە ، خوازبێنیو، هیجبێ کچی سام بەگ، بوّ، خەپوشان «قوچان» ئەم، خوازبێنی کەرانە، هاو،کات دەگەل ڕاسپاردەکانی نادر دەگەنە، کوشکی سام بەگی سەرداری کورد، (سام بەگ) لەم پێش هاتە، نا، لە بارە، زورکەسەرو، پەروش دەبێ، داهاتویکی پڕ لە مەترسیو، توشو، سەخلەتی بو، بنە مالەی خوی و، خەلکی قوچان، چاوەڕوان دەکاەتێ دەمێنێ، چیبکا خوی، بورەقەولیکی بە نادر قولی دابوە حوسین خانی کوڕیشی، خوشی لە نادر، نەدەهاتو، نەی دەویست خوشکی خوی بداتێ، سام بەگ، بو چارە سەر کردنی ئەم بابەتە گرینگە، جیواتیکی هاوبیری، لە گەورە پیاوانی کورد پێك هێنا، ئاکامی ئەم کوڕو، کوبونەوەیە، ئەوە بو، کومەلیك، بوونە، لایەنگری بڕیارو، بەلێنی بەروو، پشتیوانی نادر، هێندێکش بە پێچەوانەوە، بونە، لایەنگری شاطوماسبو، پیڕەوی ئاداب و، نەریتی کونی نەتەوایەتیو، گوتیان نادر قولی هاوشانی ئێمە نییە، دیارە حەمە حوسین خانو، شاوێردیخانو، جەعفەر قولی خانی شادلو، لەم تاقمە بونە بەلام، کچە کە خوی بە دل پێ خوشبو، شو بە نادر بکا، نەك بەشا، دوای، چەن روژ، جیواتو، ئاخەفتنو، توژینەوە، لایەنگرانی شا، ولامو، خواستی نادریان دا، دواوە نادر قولیش، بەم جەختو، وەرامە زور، تێك چو، بەرق و، تورەیەکی ئاگرینەوە، سیلاوی سوپای ئاژوتە سێ فرسەنگی شاری (خەپوشان) و، چاوەروانی ئەوە بو، شاطوماسب بو گوێستنەوەی بوك، بێ، بو،ئەوێ، تاوە کو، شانێکی لە شانی داو، باری خوی لەو، بابەتەوە ڕون کاتەوە، هەر لەو ڕوژانەشدا، (شاویردی خان) کە فەرمانڕەوای (سەبزەوار)و، قوڕخانە بە دەستی شاو، گەورەترین نەیاری نادرقولی بو، بە خوی و،

سوپایەکی قورسەوە، هاتە خەپۆشانو، جێگیر بو(شا)ش، د وای چەن رۆژێك، لە (سەناباد)ە «مەشەهد»وە بەرەو خەپۆشان، خزیو، لە قەراغ شار، مۆڵی خـوّاردە نامەیەکی بۆ (سام بەگ) نووسی، بیّ کات ڕابـوّاردن، خـەریکی جـیژنو، خـەنە بەندانو، زەماوەندی گوێستنتەوەی بوك بێ، سام بەگ، لەم، کارە ساتەش، کەوتە مەتەرسیێوە دیسان گەورە پیاوو ، سەرەك هۆزەکانی، کۆکردەوە، پاش تەگبیرو، ڕایەکی زۆر، نامەکەی شاطۆماسبی نارد، بۆ نادرقولیو، بە زمانیش پیان گـوت ڕێزلە هاوسایەتی و، هاو کەوشەنی بنیّ، بۆ ئەوەی، لافاوی خوێن نەکەوێتە ڕێ، واباشە، لە بڕیاری خوّت پاش گەز بیّوەو، دەس هەڵگریە بەلاّم نادر قولێش ولاّمی ڕاستو، ڕەوانی نەدانەوەو، چاوەڕوانی، داهاتوو، بو، بزانیّ چی ڕو، دەدا، واهەڵ دەکەویّ، شای بیّ ئاوەزو،سوکو، چروك، شەویّ، جلو، بەرگو، سیپاڵی دەگۆڕیّو، دەگەڵ ڕازدارێکی بە دزی دەچنە ناوشار، بۆ ئەوەی ملۆ، مۆیەکی دەس کەویّ، سۆزی نادر، بەم کارەی شا، دەزانیّ، فەرمان دەدا، سوپای شا، تێکەوە دەپـێچن: هەمو کەل و، پەلی سوپاییو، قۆرخانەکەشی زەوت دەکەن، تەنیا دەستێك سیپاڵی شا، نەبیّ، کە نادر ئەویش بۆ، شا، دەنێرییّتە ناوشارە ئەوسا، نادر، بە هەمو هێزو، سوپاوە، بەرەو شاری (مەشەد) دە کەوێتە ڕێ، شـاطوماسبیش، نـاوێریّ لە شـار بچێتە دەریّ، هێندیك سوّارەی کورد، دەنێرێتە شەڕی نادر، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی کەشەوە، (حەمەڕەضـا) خـانی کـەپەنگی (حەمەرەضـا) بـەگـی بـادەلاّنی (شاویردی) خانی کەیوانی (رەشید) بەگی زەعفەرانی دەگەل (جەعفەر) خانی کوڕی نەجەفقوڵی خان بەرەنگاری(نادر) دەبن، پاش شـەڕێکی زۆر تـوندو، پیـاوانـە، چونکو سوپای نادر بە توپو، تفەنگو، هەمو کەرەسەیەکی شەڕیی نۆی تەیار دەبن، سوپای کوردەکان هەرچی هەڵمەت دەبەنە سەر سوپای نادر، تێك دەشکێنو، لە هەر هێرشێکا چەن کەسیان دەکەونەبەر، ڕهێڵەی توپو، تفەنگی ماوزەڕی دەتیرە لەم گوڵەو، ئاگربارانو، تەپو، توزەدا، (جەعفەرخان) وەك شێری غوڕانو، بەوری بەیان، خوّی دەگەیەنێتە ناو سوپای نادرو، دا،دڕ دا،دڕیان تی دەخاو، هەڵ دەکاتە

سەر نادر قوڵی، بەڵام، دەبێنی لەو لاشەوە (عاشور) بەگی ئەفشار، کۆنە دوژمەنی نادرو، هاو پەیمانی جەعفەرخان، تەنگیان بە سوپای نادر هەڵ چنیوە، ئـەویش دەگەڕێتەوەو، دەگەڵ کوردەکانی تر، دەستەو، خەنجەرو، بەشیری ڕوت، سوپای نادر بڕبڕ دەکەن، وایان گێژو، کاس کردون دۆستو، دوژمن لێك ناکەنەوە (نادر)، کاتێ دەبینێ دەوروو بەری خەریکە، چـۆڵ دەبـێ، دەگـوڕێنیو، پـلاری تـانەو، سەرکۆنە، دەگرێتە سوپایەکانی و، هێندێکیان غیرەت وەبەر، دێنێتەوە شـەڕ، بـە رادەیەك توند دەبێ، سەر، وەکو گەڵاداری پـاییز، لە بـەرەو، مـەیدانـی شـەڕدا، دەکـــەوێتە سـەر زەوی (جـەعفەرخـان) کـاتێ بـۆی دەر کـەوت هـۆی و ورەو، خۆڕاگرتنی سوپای نادر، تەنیا خودی نادرە، ئەو ڕا، وەك پڵنگی چاو، نەترساو، هەڵی کردە سەر نادرو، چەن شەقاوێکی لێ نزیك بۆوە، بە لام بە ر لەوەی دەستی بیگاتێ، کەوتە، بەر گولەی گەرمی تفەنگی یەکێك لە پاریزەرەکانی نادرو، شۆڕە سواری کورد، لە سەر خوانی زین شۆڕ بۆوە، دەس بە جێ تاقمێك سواری خۆیی، خۆیان گەیاندە سەر جەعفەرخان، بەلام کار لە کار ترازابوو، گیانی دا بۆوە، بە گیان ئافەرین (نادر) بەوەکار خستنەوەی ئاگری تۆپخانەکەی، تینی بە هیزیی خستەوە ناودڵی سوپاترساوەکەی و، ورەی بـە کـوردەکـان بـەرداو، تـێی شکـاندن، لەو کاتەشدا، هەواڵیان بە نادر دا، کۆمەڵێك لە سوارانی قوچان فەرمـانیان دراوەتـێ (طەلعەت خاتونی) کچی سام بەگ، کە چو بوە (شێروان) بۆ بەڕێوە بردنی زەماوەند، دە، گەڵ شاطوماسب دابـەرنەوە (خەپۆشان) نادر، بە، پەلەپەلو تالوکە، هەر چەند ئەوشەوە، هەوا، زۆرتوشو، باو بۆرانو، کڕیوەو، باسریشك بو، هەزار سواری هەڵ بژاردەو، ئازای ، نادردە سەر ڕێگای شێروانە پاش شەڕێکی توند، دەگـەڵ ئـەم سێصەد سوارەی ناردرا، بون، بۆ شێروان، ئەو سوارانە خۆیان لە بەر سوارەی نادر نەگرتو، بێ ئەوەی بتوانن فەرمانەکەیان بەرێوە بەرن، بلاوەیان کردو، گەڕانەوە بۆ خەپۆشان، پاش ئەم ڕو داوەیە (حەمە حوسین خانی) کـوڕی سـام بـەگ (بـرای طـەلعەت خـاتون) بـە شـازدە هـەزار سـوارەوە، لە خەپۆشـان دەر کـەوتو،

بەرەنگاری سوپای نادر بو، بە شوین ئەودا، هێزە بە هەڵمەتو، دەستو، بردەکانی تری کورد، لە هەمو لایەکەوە، سوپای نادریان گەمارو، داو، تەنگەتاویان کردنو، خستیاننە بە رهێرشی بێو چانی خۆیانە لە جەندەکو، تەرمی سوپای نادر، تەپۆڵکەیان ریز دەکرد، (شاوێردیخانی ) شێخکانلو، وەك شێری شەرزە، راستو، چەپو، قیلەو، قاچ، لە سوپای نادری دەداە سوپای کوت کوتو، کەرت کەرت دەکرد، مەیدانی شەڕی لیّ کردبونە چەرمی چۆلەکە، بەوەش ڕانەوەستا، وەك بەوری بەنگاڵ هەڵی کردە سەر تۆپی نادرو لە کاری خست، لینگە، لەرزەو، دڵە تەپە، کەوتە ناو سوپای نادرقوڵی و، یەك لە شوێن یەك بە سەر شۆرێوە، مەیدانیان خاڵی دەکردە نادر سەری هەڵبڕی ، بە سەرنجەوە چاوی تیّ بڕی ، دیتی، شاوێردیخانی، بالاّ بەرزو، بەشانو، باهوّ، وەك چوّن لە جوچک دەدا، هەڵوّ بە شیری بەژار ئاو، دراو ، هەروەك داسی تازە ساو، سەر، دەقرتینیّ، گیانی پیسی نەیار، دەستێنیّ، دڵی ڕەشی زۆردار، دەردێنیّ، لەو سەرەو، سەری مەیدان ئەسپ دەچەقێنی، وەك شێری بە سام، دەگوڕێنیّ، دەنگی زراو، دەتۆقینیّ، سامدار، سامی پیّ نامێنیّ، باڵدار، باڵی دەوەرێنیّ زاتدار، بیّزات ڕا، دەمێنی، کیّ بیّ، شانی لە شانی داو، لە مەیداندا نەی گەوزێنیّ (نادر) غیرەتی وەباڵ خوّی ناو، بەرەنگاری بو، شەڕی تەن بەتەنو، دەستەو، یە خە دەستی پی کرد، پاش ماوەیەك پێکدا هاتن، شیرو، نێزە، لێك وەشاندن، شاوێردیخان، بە دورە گوڵەی نەیاران زامار بو، بەلاّم بەر لەوەی بکەوێتە بەر دەستی نادر، کوردەکان، لە مەیدانی شەڕ بردیانە دەر، دوای ماوەیەك، تۆپە ئاگر، هاوێژەکانی نادر کەوتنەوە کارو، ژمێرەیەکی زۆر لە قارەمانەکانی کورد، لە خاكو، خوێناشە لاڵ بونو، پاشماوەش پاشەکشەیان کردو، چونەوە ناوشارو، لە کوّنگرەو باروّکاندا. خوّیان، دابین کرد، لەم کاتە دژوارو، دڵ تەزێنەدا، برا، کوردەکانی (قەرا، چوّرلو) کە بە، هانای کوردەکانی قوّچانەوە هاتبون، لە قەراخ شاردادەگەڵ سوپای نادر تێك هەڵەنگوتنو، پێك وە ربون. چەن کات ئە ژمێرێك پیاوانە شەڕیان کرد، بەلاّم ئەوانیش نەیان توانی لەوە زیاتر،

خۆیان له بەر ئاگری تۆپخانەی دوژمن‌دا، ڕاگرن، (ئەوەش بڵێن، سەرکەوتویی نادر له زۆربەی شەڕەکاندا، به هۆی ئەو توپخانەوه بوەوه) (نادر) فەرمانی دا، چاڵێکی زۆر پان‌و، بەرین‌و، قوڵیان هەڵ کەند، لەم سەرماو، سوڵەتوشەدا، که ئەگەر تفت هەلاّ ویشتبا، دەی بەست، یخسیره کوردەکانی، سەرەو، خوار، تێ دەهاویشت،ئەمە، له لایەکەوە، له لایەکی تریشەوە، ڕێگای هاتوچۆی خەڵك و، هێنانی شت‌و مەکی پێداویستی ژیانی، دەبەز، بردبووه به سوپاوه، له دەوری شار، مۆڵی خواردبو،هەوا، ئەوەندە ساردبو، زۆربەی سوپاکانی نادر، له سەرمان، ڕەق هەلاّتن، باری ژیانی خەڵکی ناوشاریش ڕۆژ به ڕۆژ به ڕەو، دژواری دەچو، (سام بەگ،) ناچار هێندێك له پیاو، ماقوڵو،گەورەکوردەکانی دەگەڵ (حەمەحوسین خانی بادلانلو) دا،نا .ردە لای نادرو، لێیان خواست دەس لەم مل هورێ بەرداو، بگەڕێتەوه بۆ مەشەدە تاوەکو بەهار، دێو، هەوا، خۆش دەبیٚ،ه ئەوسا ئەمانیش دەگەڵ شاطۆماسب، دێنه مەشهەدو، مەبەسته کەش (خواستگاری طەلعەت خاتون) دەخەنه، بەر، بیرو، ڕای پیاوانی چازان و، ئاشتی خوازە(نادر) ، ئەم پێشنیارەی قەبوڵ کرد، به مەرجێك، ٢١ هەزار تمەن دراوی بۆبنێرن‌ەدوای دو، ڕۆژ، دراوەکەیان بۆ نارد، ئەویش بەرەو، مەشهەد، گەڕایەوە،له هەوەڵ مانگی بەهاردا، گەورە گەورەکانی قۆچان، دەگەڵ شاطوماسب دا چونه مەشەدە نادر، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بۆلای خۆی ڕاکێشی و، خۆبنوێنی، پێشوازێکی باشی له (شا) کردە هێشتا،کوڕی چارە سەر کردنی ناکۆکی و، بنه بڕکرنی ماکەی ، ئەم ئاڵوزێیه، دا،نەمەزرا، بو، هەواڵی هێرشی (حەمەحوسین) خانی زەعفەرانلو، (شوکر بەگ‌و، شاوێردی) خانی شیخکانلو، بۆ سەر (کەلاّت‌و، دەرەگەز،) به گوێ نادر گەیشت، ئەویش (ئیبراهیم)خانی برای خۆی بۆ، بەربەرەکانی ئەو کوردانه، نارد، بەلاّم. براکەی توانای بەرەنگاری‌و، شەڕ کردنی دەگەڵ ئەو کوردە دلیرو، قارەمانانەدا، نەبوه زۆر به پیسی،تێ شکاو، گەمارۆ، دراو، له دۆڵو، دەرەی (ئەبیوەرد،)دا، قەتیس مایەوە،ه نادر، بەبیستنی ئەم هەواڵە شاطوماسبی دەگەڵ خۆی

هەڵ گرت و، خۆی گەیاندە ئەبیوەرد، بۆ یارمەتی و، ڕزگار کردنی براکەی، لە ئابلۆقەی کوردەکانە دوای شەڕێکی توند، نادر توانی براکەی ڕزگار کاو، تالانەکانیش بستێنیتەوە، لەو شەڕە بێ وێنەیەدا، (سولەیمان بەگی) شێخکانلو، بە دیل گیراو، هەردك چاوی بە فەرمانی نادرقولی، لە کاسە هێنرایە دەرو سەر کردەکانی تری وەك حەمە حوسین خان و، دیش، نەیان توانی لە بەرامبەر تۆپخانەی بێ ئەمان و، بێ ووچانی نادر، دا خۆ ڕاگرنە ئەوە بو خۆیان گەیاندە چیا بەرزەکانی دەرەگەزو، بەرەو قۆچان پاشەکشەیان کرد. بە لێ:

پەندی پڕ بایەخی پێشینانە: کورد، لە تەنگانە، تەلانی، لانە (هەژار) نادر کەوتە شوێنیان و، شاری خەپۆشانی گەمارۆ، داە پاش چەن ڕۆژێك، دیسان دەس لە شەڕ هەڵگیراو، همنایەتی جێگیر بۆوە، بەڵام زۆری پێ نەچو، سەر، لەنوێ کوردەکانە دەستیان بە شۆرش کردەوەو، چونە سەر سوپای نادرە نادریش لای وابو، هاندەرو، هۆی ئەم هەموە گێرەو، کێشەیە، (شاطوماسبە،) شای لەمەشەدەوە هێنا بۆ قۆچانە ئەوسا هێندێك، لە نەیارو، دوژمنانی نادر، بە تایبەت چڵکاو، خۆرەکانی شاە وەك (بەیرەم عەلی بەگی) وەزیری دەرباری شا، دەستەیەکی بە ناوی ناوبژی و، ئاشتی ناردە قۆچان و، لە حەمەحوسین خانی کوڕی سام بەگی خواست، تاقمێك لە سوار چاك و، شیرو، نێزە وەشێنە بەناو بانگەکانی کورد، بە نێوی ئاشتی خوازیوە بنێرێتە لای نادرو، لە هەل و، مەرجێکی هەڵ کەوتودا نادر بکوژنە بەڵام (حەمە حوسین خان) ئەم پێشنیارە، بە دژو، پێچەوانەی خوو، خدەی بەرزی پیاوەتی و، نریتی کورد، ئەداتە قەڵەم و، ڕاسپاردەکان سەرکوێ نە دەکاو، دەیان نێرێتەوە، بەیرە م عەلی و شاطوماسب کاتی کەلکیان لەم فێڵ و، تەڵەکەیەوەر، نە گرت، خۆیان لە سوپای نادر، جیا کردەوەو، بە ڕەو شاری (نەیشابور) کەوتنەڕێ.(نادر قولی) کە ئەم رایە، گەورەترین خەنیم و، نەیاری خۆی لە مەیدانی بەربەرەکانی، وەدەر نابو، بە خەیالی ڕاحەت و، دلی پڕ لە تاسەو، هیواوە، دا و خوازێکەی سەبارەت بە خوازبێنی (طەلعەت) خاتون، لە (سامبەگ) دوپاتە کردەوە، سام بەگ و،

سەرکردەو، گەورە پیاوانی کورد، کـە، لە مـاوەی شـەڕو، گێرەو،کێشەی نادرو، خۆیاندا، قارەمانیو، ئازایەتی، سەر سوڕهێنەری نـادرو، خـوێریتی و،سـوکو، چروکی، شایان بۆ ڕون ببوەوە دەستیان لە بەر بەرەکانیو،کە لوەکێشی دەگەل نادر، هەلگرتو، بە لێنیان، دا، ئەو جار، خواستگارێکەی نـادرقولی نـەدەنە دواوەو، خزمایەتی لە تەکا بگرن، نادر، بەرەو مەشەد، گەڕایەوەو، تاقمێکی پیاو، ماقولی سوپایی و، ئاسایی لەوێوە بۆ ساز کردنو، گوێستنەوەی بـوك (وەوی) نـاردە، قۆچان:

(حوسین خانی) برای طەلعەت خاتون، خوشکی بە صەد قەرەواش و، کارە کەرو، نۆکەری سوار چاکو، لاوێ تازە پێگەیشتوی کورد، لەشاری (شێروانە)وە، هێناوە قۆچان، پاش تەدارەکو، بە جێ هێنانی یاسای خەنە بەندان، بەو جۆرە کە (موحەمەد کاظمی) پیاوو، حیسابداری نزیکی نادر قولی لە کتیبی (عـالەم ئـارای) نادری‌دا، دەڵێ، (حەمە حوسین خان) هەزارو، دوصەد «١٢٠٠» ئـەسب و مـاینی ڕەسەنو، صەدو بیست هەزار «١٢٠/٠٠٠» سەر، پەزو، چوارصەد «٤٠٠» وشتری نەڕو، نەڕمایەو، خاسە، بە باری شتومەکو، ،کەرەسەی پێویستەوە، کردە جەیازی خوشکی «طەلعەت خاتون» (موحەمەد رەضاخانو، حاتەم بەگو، رەشید سوڵطان) کە هەریەك، ڕابەرو، مەزنی هۆزە،کوردێك بون، بە نێوی بوکنچیێ رەگەڵ بوك خرانو، چونە مەشهەد (نادریش) بە هەمو سەرکردەو، فەرمان ڕەواو، بیگلەرەکانێوە ، دەگەڵ سەرناس‌و نێو بە دەرەوەکانی شار، بەرەو پیری بوك چون و، لە چەن فەرسەنگی شاردا، پێشوازێکی شایانەیان، لەم گەوهەرە نایابەی کورد کردە هەردی بەرپێیاون بە مافورەی ئاوریشمو، گران قیمەتو، گوڵی خۆش‌ڕەنگو، بۆن،ڕازاندەوە،بوکیان بەوپەڕی ڕێزەوە، دا بەزاند (نادر) حەوت شەوو، ڕۆژ بەزمو، زەماوەندی شایانەی ئەو تۆی گرت، کە تا ئەوسا، دیناوێنەی نەدیبوو، نەی بیستبو (١١٤٠ هـق) پاش تەواو، بونی ئەم بەزمو، ڕەزمە، نادر هەمو کوردە بوکنیچێەکانی بە خەلاتو، بـە راتو، خوشحالیوە ناردەوە و، نامەیەکیشی بۆ (حەمە حوسین خـانی) ژن بـرای

ناردو، داوای لیٚ کردبو، سیٚ چوٚار هەزار پیاوی دلێرو، ناودارو، هەڵکەوتوی کورد، بنێرێتە مەشهەد، بوٚ ئەوەی هەمیشە، ئاگایان لە نادرو، ماڵو، منداڵی بیٚ، حوسین خانیش نزیکەی سیٚ هەزار سوٚاری ، هەڵبژاردەی ڕەگەڵ (ڕەشید قوڵی سوڵطان و. موحەمّەد ڕەضاخانو، حاتەم)بەگ خستو، ناردنی بوٚلای نادر قوڵی بەگ،هەڵبەت ئەم پێوەندێو، خزمایەتییٚ، زوٚر، بە قـازانجو، سودی نادر تەواو بوو، بوٚە هوٚی پشت ئەستوری و، هێزو، توٚانای زیاتری نادر. هەروەك لە پێشەوەشدا باسمان کرد، ئەو زەماوەندە دو هەمین خزمایەتی نادر، دەگەڵ کوردەکانابوو، نادر ماوەیەکی زوٚر، کوردەکانی کرد بوٚوە قەلاٚیەکی ئاسنین لە بەرامبەر نەیاردەکانیدا،بە پشتیوانی ئەوانەوە، نادر توانیٚ (ئەشرّەفخانی) ئەفغـانی بشکـێنی، سـەر بـە خـوٚیی ئـێران بپارێزی، ئەمە لێرەوە، لە لایەکی کەشەوە (شاطوماسبی)، لوت دەخوڵەوە وەردراوو، ناکام ماوەوەکە، لە شاری (سەبزەوار،)دا بە سەرلێشێواوی مابوٚوە،ولاٚمی بوٚ، نادر، نارد، ئاوە کو بوٚڕەزگاری (اصفەهان) یاریدەی بداە بەلاٚم نـادر قـوڵی گـوٚی بـەم خوٚازەلوٚکێە نەداو،گوتی پێویستە لە بەرا، (خوٚراسان) لە ئەفغانێیەکان پاك کەینەوە، پاشان بڕوین بوٚ اصفەهان، ئەوسا، شاطوٚماسب نەختیٚ ئاوەزی هاتەوە بـەرو، لە خوٚی حاڵی بو، هەر ناوی هەیەو، ناوەروٚکی نیێە لە، ڕقان فەرمانی دا،خەڵکی بیٚ سوچ و، ئاوانـی (سـەبزەوار،) تـالاٚنو، قـەتڵو، بـڕکـەنەدوای، ئـەم کـارە سـاتە خوێڕیانەیە، لە،(کونەمشکا)،دا، نامەیەکی لە لایەن نادرەوە پیٚ گەیشت، کە، شا، بێو، لە شەڕی ئەفغانەکاندا هاو بەشی بکا، بەلاٚم شـای وەجـاخ زادەو، خـوٚش گوذەران، خوٚی ناسی بوو، دەیزانی پیاوی شەڕو، کەژو، کێو، مەیدانی جـەنگ نیێە، لەوەراما، نوسیی، نەتوٚ، دێیە (کونەمشکانی ) قاقڕو،بیٚ ئاو، نـەمنیش دێـمە سەبزەواری بیٚ خەلەو، دانەوێڵە، بە شوین ئەم پەیـامەدا، ڕاگەیەننـامەیەکـی بـوٚ خەڵکی خوٚراسان نارد، کە تیا نوسی بوو لە ئەمڕوکەوە، نادر قوڵی، لە لایەن منەوە لە هەمو کارو، بارێکی حوکومەتی و، سوپایی، لیٚ خراوەو، مافی هـیچ چـەشنە کارێکی نییەبەم جوٚرە، خەڵکی ناوچەی خوٚراسانی لە نادر هانداە نادرتیٚ فکری

ئەم هەویرە ئاوی زۆردەویێ، کەوتە خۆو، نـامەیەکـی بـۆ (حــەمە حوسین‌خـانی) زەعفەرانلوی ژن برای نوسی، کە ئاگای لە قۆچان بێ، ئەگەر، هاتو، کوردەکانی دژ بەنادرو لایەنگری شاطۆماسب، سەر بزێویان کرد، سەرکویتان کـا، بـۆ خـۆشم دەچم بۆکوێنەمشکانو، (شا) دێنم بۆ مەشهەد، دوای ئەم کارانە ، زۆری نەخایاند، (تورکومەنەکانی خوارەزم،) شورشیان کردو، ئالاّی نەیاری خۆیان لە دژی نادر، هەڵ کرد، نادر دیسان نامەیەکی بو حەمە حوسین خان نوسی، کە پێویستە لەم سەرکوت کردنە شدا، یارمەتیم بدەی، بەلاّم، خان دەگەڵ ئەوە شاخوشکی خۆی دا بو، بە نادر قولیو، بڕوایەکی توندی بە ئازایەتیو، بوێری نادر هەبوو، دیسان بە کەسری شانی دەزانی، سەر،وە بەر نادر بێنی و، بچێتە ژێر باڵی ئەوانەوە، خۆاستـەکـەی نادری قەبوڵ نەکرد.

هــاوکات دەگـەڵ سـەر بـزێویی تـورکومەنەکـان،دا،کـوردانـی (شـادلو، قەراچۆرلو)ی هەریمی (سەمەلّقانو، گەرمەخـانی بـجنورد)یش لە دژی نـادر قـولّی ڕاپەرین، نادر خۆی ڕوی کردە خوارەزمو، ئیبراهیم خانی براشی، دەگەڵ (ڕەحیم خـانی) گرامیلی، بە سوپایەکی قورسەوە، ناردە سەر کوردەکانی شادلو، هـەڵبەت ئیبراهیم خان دەروەستی کوردەکان نەهاتو، یەخسیرکرا، نادر تورکومەنەکانی تێ شکاندو، پاش ئەم سەرکەوتنە، بای داوە، سەر کوردەکانی شادلو، دوای شەڕێکی زۆر توند، بە هۆی توپخانەکانییەوە، بە سەرئەوانیشدا، زاڵبو، براکەشی لە دیـلی ڕزگار کرد،نادر، دوای ئەم سەرکەوتنانە لە ڕۆژ ١٨ی مـانگی صـەفەری سـالی ١١٤٢ی کۆچی مانگی دا، دەگـەڵ شـاطۆماسبی صـەفەوی چـونە اصفەهـانو، ئەوێشی لە دەس لاوەیە ئەفغانییەکان هێنایەدەر، لە سـاڵی ١١٤٣دا، واتـە دوای خواستنی پوری شاطوماسب ڕوّیی بۆ شەڕی ڕۆم (تورکانی عوثمانی) پاشان لە ساڵی ١١٤٨دا، هەمو شازادە سەربزیوەکانی صەفەوی لە ناوبردو، بە ئـاواتـی لە مێژینەی خۆی گەیشت، دوای ئەوە لە مانگی بەفرانباری سـاڵی ١١١٥ کـۆچی هەتاویدا، لە دەشتی (مۆغانی ئاذەربایجان ڕۆژئاوا)دا، تاجی شایەتی لە سەر خۆنـاو،

(نادرقوڵی) له تەمەنی ٤٧ ساڵیدا بو، (نادرشا)، یەکەمین کەسێکی دوای ئیبراهیم خانی برای نادرشا له بەڕاقی تاج له سەر ناندا، بە ناوی نوێنەری کوردی خۆراسان پیرۆزبایی به نادرشا گوت (سام خانی زەعفەرانلو) باوکی (طەلعەت خاتون)و، خەزورەی نادر بوە له مانگی فەوریەی ساڵی ١٧٣٦ی زایەنیدا، نادر له (مۆغان)ەوە گەڕاوە قۆچان و، چەن ڕۆژێك میوانی سامبەگی، خەزوری بوە هەر لەوێش له قەبو، پلەی (بێگلەر بەگی)دا ،بە (حەمە حوسین خانی) کوڕی سام خان، دیارە له سەر دەمی نادرشادا، دوکەس بەم پلەیەکە، گرینگترین پلەی حوکومەتی بون، دەگەنە یەکەم ئیبراهیم خانی برای نادر، دوهەم حوسین خانی زەعفەرانلو، ئەوەش بلێن، نادرشا، دوای گەڕانەوەی لە شەڕی بەغدا کە دەگەڵ تورکانی عوثمانیدا، کرا، گەڕایەوە خۆراسانو، چوە (کەلات)و، دەستی کرد، بە ئازارو، ئەشکەنجەو، تالاَنو بڕوی کوردەکان،ئەوە بو لە شەوی بیستەمی مانگی تەموزی ساڵی ١٧٤٧ زاینی بەرانبەری ١٣ جمادیالاخر سالی ١١٦٠ کۆچی مانگی له کاتێکا خۆی تەیار کردبو، دیسانەوە بە تۆپو جوبەخانەو سوپاوە هێرش بەرێتە، سەر کوردەکانی زەعفەرانلوو، شادلو، بە دەستی خودی کوردەکانی دەربارییی کوژراو، ئەم ئارەزۆشی بردە بن گڵ، ئەوە بو چیرۆکی (نادر قوڵی ئەفشارو، شاطوماسبی صەفەوی و، طەلعەت خاتونی کچی سەردارو، گەورەی) کوردەکانی زەعفەرانلوی خۆراسان،کە ماموستای هونەرو، پایەبەرزی کوردی زەنگەنە (مامۆستا نوشادی دینەوەری)لەم هەڵبەستانەدا، باسی لێوە کردون، کە، دەڵێ:

ئیستە دەعوای (دوخت ، نادر، سولطانەن)[1]

عالەم، جە جەورەش بێزار، جەگیانەن

رعیەت فەرار، خەڵق خولقەش تەنگەن

اقبالْ ئەولاد (شاصەفی) لەنگەن

---

١ تا، ئەیسا، یەدەور، نادر سوڵطانەن - مەردوم، جە، جەورەش... ن-غ-ض-

دیاره هەروەك مامۆستا نۆشاد هێمایان بۆکردوە، شاطۆماسبی صەفەوی کە ئێمەش بە پێی تۆانا باسمان بۆکردون، لەم کەلەوەکێشیو، هۆملکێیەدا، تیٚ شکاو، نەیتوانی طەلعەت خاتون وە دەس خاو، شایەتی بکا.

هەڵبەت بۆ نوسینو، ڕۆنکردنەوەی مەبەستی ژۆررو، زۆرتر کەلکم لەم نوسراوانەی خوارەوە وەرگرتوە

١:جیهانگوشای نادری: دانراوی میرزا مەهدیخانی ئوسترابادی میرزاو، هەواڵ نوسی نادر،کە تەواوی هەواڵو، شەڕو، شوڕەکانی نادری تاکۆتایی ساڵی ١١٦٠ – ه ق کە ساڵی کوژرانی نادرە نوسیوە، دیارە دوڕەی نادریش هەر هی ئەوە کە لە ساڵی ١١٧٢ نوسراوە.

٢: ئێران دەر، دەورەی قاجار: دانراوی دوکتور عەلی ئەصغەری هەمەدانی

٣: دراسات حول ایران: دانراوی دوکتور کەماڵ مەظهەر ئەحمەد بە زمانی عەرەبی)

٤: زیندە گیٚ پڕ ماجرای نادر: دانراوی نادری مەمێندی نەژاد

٥: عالەم ئاڕای نادری: دانراوی موحەمّەد کاظم، موستۆفی نادرشا

٦: حەڕەکەتی تاریخیٚ کورد. بە خوراسان: دانراوی برای بەهەستو، هێژام، کلیم‌الله توّحدی

٧: بەردو، نوسراوەی سەرگۆری نادر: لە مەشهەد کە خوم لە بەرم نوسیوەتەوە بە خواستو، یاریدەی خوداوەندی میری مەزن ئەم چیرۆکەش لە رۆژی حەوتەمی مانگی پوشپەری ساڵی ٢٦٠١ی کوردیدا، بەرانبەری ١٣٦٨/٤/٧ کوچیٚ هەتاوی و ٢٤ ی ذی‌القعدەی ١٤٠٩ کۆچی مانگی و، ٢٨ی ژوئەنی ١٩٨٩ زایەنی بە دەس منی کوردی بەش خوراو (مەلا عەزیز داشبەندی) موحەمّەدپور، لە شاری تاراندا، نوسرایەوەو، کۆتایی هاتەهیوامە، وە بەردلی خوێنەرەوە ئازیزەکان کەویٚ و، لە بەردلیان نەکەوێ و، بیزی لی نەکەن

هەر چێك بیٚ کُردیو، خودیێە.

به ناوی خودا

# جێگەو، ناوەکانی، داری پیرەدار
# لە ئامادەکردنی، موحەممەدپور،
# (مەلا عەزیز داشبەندی)

١٧/٤/١٣٦٧هەتاوی: تاران

بو:واتاو: مانای ووشەکانیش بڕوانئە:
فەرهەنگۆڵەی (شەماڵو، زریان)
لە ئامادەکردنی خوٚم

«هەڵبەت لێرەشدا: پاش‌و، پێشی ووشەکانم بەگوێرەی ڕیزی ئەلف و، بیٚ، دەبەر چاو،نەگرتوە»و، بەپێی هاتنی ووشەکان لە هەڵبەستەکان،دا، دووام

## «ناوه‌كان»

(قه‌يس) ناوى چه‌ن كه‌سێكى به‌ ناوبانگى عه‌ره‌ب بۆوه‌ ١: (قه‌يسى ته‌ميمى) (٦١٩-٦٩١) كه‌ جاحيظ له‌ كتيبى «أالبيان» دا باسى كردۆوه‌ ده‌ڵێ. قه‌يس هۆزه‌كه‌ى خۆى هه‌ڵنا، بۆ ئه‌وه‌ى له‌ سه‌ر ده‌ستى حه‌ضره‌تى عومه‌رى فاروق، ره‌ضاى خواى لێ بێ. موسوڵمان بن‌و، ئايينى پيرۆزى اسلام وه‌رگرن‌ه خۆشى له‌ گرتنى شاره‌كانى «قوم، كاشان‌و، اصفه‌هاندا، له‌ ساڵه‌كانى ٦٤٤-٦٤٩ـز،دا، هه‌روه‌ها، شارى «هه‌رات، به‌لخ‌و، مه‌رو» دا، به‌شدارو، فه‌رمانده‌رى سوپاى اسلام بۆوه‌. له‌ شه‌رى «جه‌مه‌ل»دا، بێ لايه‌ن بوه‌، له‌ شه‌رى «صه‌فه‌ين»دا لايه‌نگرى حه‌ضره‌تى عه‌لى بۆوه‌، ره‌ضاى خوداى لێ بێ، پاشان له‌ شارى كۆفه‌دا، كۆچى دوايى كردوه‌و هه‌ر له‌ويش نيژراوه‌ ٢: (قه‌يسى ئه‌شعه‌ث) كورى مه‌عدى كه‌ريب ئه‌ويش يه‌كێك بۆوه‌ له‌،گه‌وره‌ پياوه‌كانى «كينده‌»و، ده‌گه‌ڵ كومه‌ڵێ له‌ هۆزه‌كه‌ى له‌ ساڵى ٦٣١ى زايه‌ينيدا، ده‌چنه‌ خزمه‌ت حه‌ضره‌تى ره‌سولى ئه‌كره‌م سلاوى خوداى له‌سه‌ر بێ، و، موسوڵمان ده‌بن، له‌ شه‌ره‌كانى «قادسيه‌» نه‌هاوه‌ند، يه‌رموك‌و، صه‌فين»دا به‌شدارى كردوه‌: ٣: قه‌يسى زوهه‌رى يه‌كێ بۆوه‌ له‌ هه‌ره‌ ده‌ سه‌ لاتداره‌كانى هۆزى «عه‌به‌س» ٤: قه‌يسى روقيّات شاعيرى ناودارى قوره‌يشى، ديوانى هه‌ڵبه‌سته‌كانى،كه‌ زۆربه‌يان راميارى‌و، ميژوين له‌ ساڵى ١٩٥٨ زايه‌نيدا، له‌ بيروت چاپ كراون ٥: قه‌يسى فه‌هه‌رى كه‌ له‌ ساڵى ٦٨٣-٦٨٥ دا، والى‌و، پاريزه‌رى شارى كۆفه‌، بۆوه‌: ٦: قه‌يسى مازونى كه‌، ميژوى خه‌ليفه‌، موكته‌ فى له‌ ساڵى ٩٠٢-٩٠٨دا، نوسيوه‌:

کەڵیوس: قەڕپوز، قەربووس قارپوز، کەوڵی بۆز، کەڵبەی زیـن، کۆهـانەو، خۆانی زین،یان کە ڵی بۆز، واتە ، دێزە، پنوکو، خاڵ خاڵاوی، بڕیتییە، لە گـوی درێژ،یان بەووتەی مامۆستاکانی ئایینی، «مـرکَبُ الصُّلحـاء » واتـە چـارەوێی پیاوچاکان، هەڵبەت تازەمانی موفتی زەهاوی، بەغدا، و، مەلا گچکەی هەو لێرو، حەفتاو، هەشتا ساڵ لەمە بەریش سوار بونی گوی درێژ، بە سونەت‌و، شتێکی باش، دەژمێردرا: کەوابو، دەکرێ. کە ڵبۆس کەربۆز، بوبێ، چونکو، لە زمان‌و، وێـژەی کورد، دا لام و، ڕێ [ل-ر] سین و، زێ [س-ز] زۆر جار، جـێ گۆرکییـان پـێ دەکرێ. (ئەفراسیاب) واتە ، پیاوی بەسام‌و، هـەیبەت،یـان ئـاف‌فرەسیاو،یـانی خاوەنی ئاوی زۆر چونکو هـێندێك لە زانـاکـان لایـان وایـە، چـاوگەو، ئـاوی سەهەندو، سەهۆڵان‌و، وورمێ، بە دەس ئەفراسیابەوە، بۆوە، هەریمی کرمـاشان، کوردستان، هەمەدان‌و، ساوەش، بە دەس رۆستەمی (زاڵ)وە بۆوە، ئەفراسیاو، بە ناوی شای (توران)، یان تۆراو، جیا بۆوەو، زیز بۆکان چەن ساڵ دەگەڵ ئێرانی،یان نیشتە جێو، دامەزراوەکاندا، شەڕی کرد، پاشان لە سەردەمی (کەی خوسرەو)دا، کوژرا،یان بە واتەی هێندێك،کاتی بە شوین تاجەکەیدا، دەگەڕێ، لە ناوگۆمیلکەی خۆی (چی چست) «ورمێ»دا، دەخنکێ.»

(کەی خوسرەو): سی هەمین شای زنجیرەی کەیانی و ، کوڕی سیاوەشو، فەرەنگیسی خۆشکی ئەفراسیابە: دوای ئەوەی باوکی بە فەرمانی ئەفراسیاب، دە کووژرێ خۆی دەگەینێتەوە ئیران‌و، پاش چەن سالێك تۆڵەی باوکی لە ئەفراسیاب، دەستێنیتەوەو، دەی کوژێ. یەکێك لەکارەگرینگەکانی کەی خوسرەو، لە ناو بردنی «بوتکەڵە»ی قەلای بەهمەن بوە کە، لە کەناری گومیلکەی ورمێ، دانرابوو: (طـاق بۆستـان:) ئیستە کە ئاوایەکە، لە سەررێگای پێشوی سنەو، کرماشان‌دا، بوە. واتە ٧/٥کیلومیتر لە کرماشان و ١۴٣کیلومیتر لە شاری سنەوە، دورە. هەڵ کەنراوەی تاق بۆستان، کە وتوتە، داوێنی کێوی (پەڕاو،) چاوگەیەکی پر لە ئاو، لەو، کێوە هەڵ دەقوڵێ، کۆنترین، بەرد، هەڵ کەنی و، داتاشراوەیەکی لەم، کێوەدا، کراوە، تاج لە سەر نانی ئاردەشێری دوهـەمی سـاسانییە، ئـاهۆرامـەزدا ئـالقەی شـایەتی بـە ئەردەشیرێ دەدا، میتراش، واتە رۆژ، نوری پڕ تەووژمی خۆی، بـە سـەردا بـلاو،

دەکاتەوە، هێندێك کەسیش لایان وایە، ئەو، وێنەیە، تاج لە سەر نـانی شـاپوری دوهەم‌و، سیّ هەم، خو سرەو، پەروێزو، شەو دێزە، کە، ئەناهیتا،یان شـیرین، بـە لایەوە ویستاوە،دیارە نوسراوەشی هەیەو، بە خەطی پەهلەویشە:

(طاق دیس:) تەختی شایەتی خوسرەو پەروێز بۆوە: (طوس:) کوڕی نۆذەر، پاڵەوانو، گەورە سەرداری بە ناوبانگی بنەمـاڵەی ئـێرانـی بـۆوە، لە سـەردەمی شایەتی کەی قوبادو، کەی کاووس‌و، کەی خوسرەودا، دیارە ئەم «طوس»ە، هەر ئەوەیە کە لە ئاوێستادا، بە ناوی توسە Tusa ناوبراوە، (تەهماسب:) واتە ، قەوی قۆڵو، بە هێز، ئەسب‌و، چارەوای تـوندو، تـوڵو، بـە لەزو، تـیژرۆ، دیـارە نـاوی دواهەمین شای پێشدادی بۆوە (تۆهماسیب:) ناوی دوکەس لە شاکانی صەفەوی بۆوە بە ناوی (١) توماسبی کوڕی شاه سمـایلی یـەکـەم ٩٣٠-٩٨٤ ه‍ ق، (٢) توماسبی کوڕی شاه سوڵتان حوسینی صەفەوی ١١٠٦-١١٤٤ کە یازدەهەمین‌و، ئاخرین شای صەفەوی بۆوە، دیارە بـە دەسـتی نـادرشای ئەفشـار لە سەرکـار، وەلانراو، نادر قوڵی خۆی بو بەشای ئێران، (نادر قوڵی) لە ساڵی ١١٠٠ ه‍ ق) لە ناوچەی دەستگردی سەر، بە دەرەگەزی قوچانی خوراسان دا، هاتۆتە دنیاوە، لە ساڵی ١١٤٨ دا دەبێتە شا، لە ساڵی ١١٦٠دا، رۆژێ یەکەشە مۆسێزدە هەمی مانگی جمادی‌الاخری دەکوژرێ (کەی قوباد): واتە شای خۆشەویست‌و، بەرێز: قوباد ناوی یەکێ لە شایەکانی ساسانی‌و، کوڕی فەیرۆزی یەکەمە ٤٨٧-٥٣١ – م، لە زەمانی ئەم قوبادەدا، (مەزدەك)، هەل دەستی و، ڕا بەرایەتی خۆی ڕادەگـەیەنیّ، قوباد شایەکی خاوەن هێزو، تواناو، بە دەسەڵات بۆوە، دەوڵەتی ڕۆمی ئەوساکەی خستبۆوە لە رزەو، مەترسێوە. دەگەڵ (جاماسبی) برای کە، ماوەیەك شایەتی لە دەس قوباد هێنا بۆدەر، برایانە ڕەفتاری کرد، پاشان بە هۆی نە خۆشێوە لە ساڵی ٥٣١ زایەنیدا، مرد: (تەهمورث): لە دو بەش پێك هاتوە (تەهمو) واتە، ئازاو، نەترس‌و، بەهێز (رث) واتە، جودا، یانی دور، لەترس، ئـەو نـاوە هـەروەك لە ئـاوێستاشا هاتۆوە، ناوە بوە، بۆ جۆرە گەماڵو، کسۆکێکی تایەبەت‌و، بە ئەمەگ. دیارە لێرەدا، ناوە بۆ یەکێك لە شاکانی پێشدادی کە، «دێو بەندیشیان پیّ گۆ تـوەو، بـە دوای هۆشەنگ دا هاتۆە: (فەرامەرز): کوری ڕۆستەمی زاڵە، لە زوربەی شەڕەکانی ئێران‌و،

توورواندا هاوشانی، باوکی، هاوبەشیی کردوە، (ئەسفەندیار) بەهمەنی کوڕی بە ڕۆستەم، ئەسپارد، بۆ ئەوەی بۆی بعاملێنێ ، بە همەنیش دوای گۆشتاسب، بو، بە شاو، سوپای ناردە سەر فەرامەرز، بەلاّم دیارە فەرامەرز لەم شەڕەدا، بە دیل گیراو، بە زیندویی بەدارا، کرا، وەك فیردەوسی دەڵێ: فەرامەرزی بە زیندویی بە دارا، کرد: لەشی فیلی بە سەر شوّڕی ، بە دارا، کرد (محمّدپور) (ئەسکەندەر): کوڕی فلیپی مەقدونی بۆوە، لە ساڵی ٣٣٣ی بە ر لە زایین‌دا، هیرەشی کـردە سـەر ئـێران و، داریوشی سێهەمی تێك شکاندە پاسارگادی سوتـاند، ئـەسکەندەرییە میصری بنیات نا، پاشان بە ئازارە باریکەیان چاو قوڵکە، لە گومەلّیـانی لای هـەو لێـری کوردستانی عێراق مردو، بە ئاواتی ئاوی حەیات نەگەیشت:

(فەرهاد): بە رد تاشی لوڕو، هاوچەرخی خوسرەوو، پەروێزە، چـیرۆکـی ئەوینی ئەم قارەمانە کوردە دەگەڵ شیرینی شادا، ئـەوەندە نـێودێرە، نیـازی بـە باسکردنی من نییە، دیارە ، فەرهاد- ناوی پینج کەس لە شاکانی ئەشکانیش بۆوە

(١) ١٨١-١٧٤ ق - م (٢) ١٣٦-١٢٧ - ق م (٣) ٦٩-٦٠ (٤) ٣٧-٢ - ق - م

(٥) پانزدەهەمین شای ئەشکانی -٤ م

(فەریبورز): کوڕی کەیکـاووس بـۆوە، دوای ئـەوەی کـەی خـوسرەو، لە تورانەوە، هـاتۆتە ئـێران، کەیکـاووس کـردویەتە ، جـێی‌نشینی خـۆی، ئـەوسا فەریبورزیش، لێی دەبێتە بەر هەڵست لە ئاکامدا، کەیکاوس دەڵێ ، هەرکـامتان بتوانن (دژی بەهمەن) کە لای (ئاردەوێل) بۆوە، بگرن شـایەتی هـی ئەوەتـانە، دیارە، فەریبورز، ناتوانێ قەلاّکـە بگـرێو، شـایەتی لە کـیس دەچـی،و بـۆکـەی خوسرەو، موسوّگەر، دەبێ

(گورش ئەسب یان گورشـاسب): ئـەسپی لەڕو، لاواز، دیـارە نـاوی بـاپیرە گەورەی روستەم‌و، کوڕی ئەشرەط. کوڕیّ سام، کوری توڕەگ، نەوەی فەرەیدون بۆوە، گورشاسب، یەکێك بۆوە لە پاڵەوانە ناودارەکانی ئێران، هەروەها ناوی کوڕی زۆراب و، دەهەمین شای پێشدادی بۆوە، بە واتایەکی کە، گۆرشا، گۆر، کێو، چیا، یانی شای کێو، کەژ. دیارە ئەمەش لەقەبی کەیومەرث بۆوە، (شاکۆش) ٣٧٦٧ میتر بەرزەو، کەوتۆتە باشوری گورگانو، رۆژ هەلاّتی بـاکـوری کـیوی ئـەلبورزەوە:

(شاكۆی غەرب) واتە رۆژ ئاواش. بەشێكە لە زنجیرە كێوی پشتكوۆ نێوان ئێران و، عێیراق، دیارە بەرزترین لوتكەی ئەو كـیوە (دالاهـویە) dalaho ، ئـەم چیـایە كـە زۆربەی ساڵ سەری بە مێزەرە بەفری سپی داپۆشراوە,دەڕوانێتە ویشكانی ولاّتی عێراق، سەرچاوەی پڕ ئـاوی زیـیّ گـەورەی (ئـەروەند رود) لەو كـێفەوە هـەڵ دەقوڵێ، بە راستی لە لانی خۆشی‌و، زەنوێریشەوە كەم جێگای ئاوا خۆشم چاو، پێكەوتۆەە مەگین مەصیف صەلاحەدّین دیارە لەكوردستانی ئازیزدا، لەم شوینانە زۆربەر چاو دەكەون (دینەوەر): ناوچەیەكە، لە بەشی شاری صەحنەی كرماشان، ئاوایەكیش هەر بەو ناوە كەوتوتە زۆخی چەمی دینەوەرەوە، دیارە ئەم چەمەدەگەڵ چەمی گاماسب یان جاماسبا تیكەڵ دەبنەوەو، دەچنەنەوە سەر چەمی قەرەسوی كرماشان.

دینەوەر لە زەمانی ساسانیەكاندا، كاروانەڕێ و، جێگای پشودانی نـێوان ئاورگەی ئاذەر (گۆ شەنسب) و، شاری (مەداین) بۆە، ئـەمرۆش لە بـێستونەوە ڕێگایەك بەلێوارەی چۆمی دینەوەردا، بۆ شاری (سونقوڕی كولیایی) كراوەتەوەو، بە نزیك ئاوایی دینەوەردا تیّ دەپەڕێ. وەك لەكتیبی مُعْجَمِ‌اَلْبُلْدانِ بەلاذریداهاتۆە، (ئەحمەد، كوڕی جابر (ق ٩ م) و، المنجدیش باسی دەكا، پاش ئەوەی لە سالی ٦٤٢ زایەنیدا، دوای شەڕی نەهاوەند لە زەمانی خەلیفەی دوهەمـا (حـەضرەتی عومەر،رض) كەوتە دەس اسلام، یەكێك بۆە لە هەرە ئاوەدانیكانی، پڕ حاصلّ و، باغ و، خۆش هەواو، بە یەكیّ لە شوێنە خۆشو، زەنوێرەكانی ناوچەی كێویستان، دائەنراە لە سەردەمی ئومەوی و، عەبّاسیشا هەروەها، بۆوە، تا ئەوەی لە شـەڕی مەردئاوێژی (مەردئاویجی) گیّلاّنیدا، ویرانو، كاول كراو، ئەوەی، بوش تەیمورە شەلەی مەغولی لە سالّی -١٤٠٠م، خاپوری كردە هەڵبەت دینەوەر، پاش اسلام، پیاوی زۆر گەورەو ، نیوّدێری وەك، ئەحمەد، أبوحنیفەو، ابن قوتەیبەو، هی‌تری بۆە، ئەگێرنەوە، فەقێیەك دوای ئەوەی لە خوێندگای نیظامێەی بەغدا، ئەگەڕێتەوە ئێران، ڕێگەی دەكەوێتە دینەوەرو، دەگەڵ یەكیك لە زاناكانی ئەویّدا[1] دەكەوێتە وتوۆێژەوە دەبینیّ زۆر لە مامۆستاو، زانایانی بەغدا، زاناترە،پاشان پێی دەڵیّ، تۆ،

[1] واتە:ابن الكُج

زۆر زۆر، له فلاّن زانای به ناوبانگی بەغدا،[1] زاناتری بەلاّم تۆ نێوت دەر نەکردۆە، ئەویش لەولاّما، دەڵی حَطَّتني دينَوَرُ، وَرَفَعَتْهُ آلـبغداد: واتـە، چـونکو دیـنەوەر چوكو، بیّ خاوەنو، ناو، کەوتۆتەوە، منیشی، بیّ ناو، نیشان کردۆە، بەلاّم چونکو بەغدا، گەورەو، ناودارە، ئەوزانایەشی گەورە کردۆتەوە، دێوی سپی: پاڵەوانـێکی زۆر، به هێزو، شانو، باهۆی مازەندەرانی بۆوەو، له سەرئـاییني مـیترا پـەرستی ئەمێنێتەوەو، ئاييني خواپەرستی ئەوساکە، وەرناگریّ. پاشان، به دەس رۆستەمی زال ئەکوژریّ :دەماوەند:یان، دەماوەن، ون، دەم، دەمە، بوخار، هەڵمو، دوك ئەوەند، وەند، واته خاوەن هەڵمو، دوکەڵە یان له دەم و، بو خارا، ون بوو، چـونکو ئـەو کێوەش وەك ئەهولاّن، ئاگرپژین بۆوە، پاشان، دا، مرکاوە. دەماوەند، یەکێکه له زنجیرەکێوەکانی ئەلبورزو، باکوری رۆژ هەلاّتی شاری تاران، لوتکەی ئەم چیایه بەرزترین لوتکەی ئێرانو، ٥٦٧١ میتر بەرزایەتیە ئەوکـێفه. پـێوەندی هـەیه بـە چەرخی چوارەمی زەوی ناسێوەە داويني ئەم کێوە پڕە لە، چاوگەی ئاوو، گەرماو، گوگردو به واتەی المنجد، حەفتا رۆندولو، چاڵی ئاگرپژيني کـوژراوەوەی پـێوە، یەکەمین کـەسێك له سـاڵی ١٧٩٨ زایـنیدا، بـەوکێوەدا، هـەڵ گـەراوە، ئولیڤـای ئوروپایی بۆوەە نێو دێرترین گەرماوی ئەوکێوە داریجانه، شاری دەماوەندیش که، له دوڵو، دەرەیەکی زۆر، ئاوو، هەوا، خۆش دا، هەڵ کەوتۆە، کەوتۆتە، لای رۆژ ئاوای کێوەکەوەە دیارە چـەن ئـاوایـی کـوردی دور خـراوەش له دەورو بـەری دەمـــاوەندا ئـەژین وەك جـابان و، سـەربەندانو سـورخـەدیّ. سیـاوەش: یـان سیاوەخش خاوەن ئەسپی رەش واته: رەش، سـوار، نـاوی کـوری کەیکـاوسی کەیانی بۆوەە سودابەی ژنی کەیکاوس، به تـاڵی ئـەويني، گرفتـار دەبـیّ، بـەلاّم سیاوەش گوێ، به باوەژنی ناداە ئەویش لای باوکی شوڤاری لێدەکا، کەیکاوس، به پێی یاسای ئەوسا، ئاگری بۆ قەلاّ مەشخەڵ دەکا، تا سیاوش، به ناویدا، تیّ پەڕیّ، ئەگەر تاوانبار بیّ، ئەوە بسوتیّ، ئەگنیا، به خۆ تەکاندنو، ڕاوەشاندن، به ناویا، تیّ پەڕیە سیاوەش، به سلاّمەتی، به نێو ئاورگەکەدا، ڕا، دەبریّ، پاشان زیزو، زویر، دەبێو، دەچێته لای ئافراسیاب ئەویش فـەرەنگیسی کچی خـوّی دە،داتـیّ، بـەلاّم

---

١ واته: ابوحامد اسفراینی

گرسێوزی برای ئەفراسیاب، بە فیڵو، تەڵەکە، بە کوشتنی دەداو دوای ئەوەی کـەی خـوسرەوی کوڕی سیاوەشو، فەرەنگیس، گەورە دەبێ، بۆ تۆڵەی باوکی، بـە کـژ، ئەفراسیابا، دێو، چەن ساڵ، ئەم شەڕە. ناکوژێتەو تا لە ئەنجاما تۆڵەی سیـاوەش دەستێند ڕێتەوەو لەو ساوە. تا ئیستا باوەو، بۆتە، دەمە خوشکە (ضربُالمـثل)و، دەڵێن: بۆتە خوێنی سیاوەشو، ناکوژێتەوە:

شاپور: واتە کوڕی شا، لە زنجیرەی شایانی ساسانیدا، سێ کـەس نـاویان شاپور بوٚوە ١: شاپوری کوڕی ئاردە (هەردە، عەردە، واتە کەژوکێو) شێر، واتە شێری کەژوکۆ، کە لە ساڵی ٢٤١ـ ٢٤٢ق ـم،دا تاجی شایەتی لە سەر دەنێ و تا ٢٧٣ دەبێتە جێ نیشنی باوکی ٢: شاپوری دوهەم. ناودێر، بە ذوُالأکتافْ واتە قەوی قوڵو، بەشانو، باهۆ ٣٠٩-٣٧٩ - بەر لە عیسا ٣: شاپوری کوری شاپوری دوهەم ٣٨٨: ئەوەیان زۆر بێ هێزو، بێ تین دەبێو، لە خوڕا. دەکەوێو، دەمرێ شەودێز: یان شەب دێز، ناوی ئەسپی خوسرەو پەروێز بوٚە. خوسرەو زۆری خۆش ویسـتۆە، دیارە وینەی ئەم ئەسپە دەگەڵ خوسرەوو، شیرین دا، لە تاق بۆسانی کرمـاشانا، هەڵ کەندراوە. رویین تەن: لە قەبی ئەسفەندیار بوٚوە تەهمتەن: لەقەبی ڕۆستەمە

(زاڵ): واتە پیرو، زۆرهان، سەر کەوتوو، پیرۆز، نـاوی بـاوکی ڕۆسـتەمی ناودار بوٚوەکاتێ لە دایك بوٚە، هەمو، موی سەری سپی دەبێ، جا بەم، هۆیەوە پێی دەڵێن زاڵو، مناڵە پیرە (گۆدەرز): پاڵەوانێکی ناوداری ئێرانی بـوٚوە لە سـەردەمی شایانی کەیانیدا، بنەماڵەی گۆدەرز، پاش بنە ماڵەی سامی نەریمان (ڕۆستەم) لە هەموکەس نێو دێر، تر، دەبن، باپیرە گەورەیان (گۆشداد)ی کلاوزێرین بوٚە، کە لە زەمانی (فەریدون)دا، ژیاوە (گۆران): ناوچەیەکە، کە وتوٚتە باکـوری ڕوژئـاوای شاری کرندی کرماشان، چەند لوتکەی بەرز، لەم ناوچەیەدا، هەڵ کـەوتۆە وەك شاهانی کە ٢٥٦٢ میترە ئاوتابی ٢٤٥٥ میترە، گڵەزەرد، ٢٢٠٧ مـیترە هـەڵبەت ناوچەی گۆران لە زەمانی زودا، ناوچەکانی، شارەزور، مـەریوان، هـەورامـانو، گۆرانی ئەمرۆی گرتوٚتەوە (گیو): کـوڕی گـۆدەرزو، زاوای ڕۆسـتەمی زاڵ بـوٚوە (بێژەن)ی ناوداریش کوڕی ئەم گیوە بوٚە (کەیومەرث)یان کەی مەرت یا مەرث هەمیشە زیندو، یان شای مەردو، لێهاتوە بە واتەی ئاویستایەکەمین مرۆڤی سەر،

ڕۆی زەوی ئادەم بووە، بەڵام، بە گوتەی شانامە، کەیومەرثی ئێرانی بۆوە (مەنیژە):
کچی ئەفراسیاو، بۆە، (بیژەنی) کوڕی گیو ئـۆگـری دەبـیۆ و دەکـەوێتە شـوێنی، ئەفراسیاب دەیگریۆ، دەیخاتە سیا چاڵەوە، پاشان ڕۆستەمی زاڵ کە خاڵوی بیژەن بۆوە، بم کارەساتە دەزانیۆ، دەچێ بیژەن لە بەند، ڕەزگار، دەکا: (ڕۆستەم):واتە باڵا بەرزو، تێك سڕماوو، قەوی قۆڵ، کوڕی زاڵی کوڕی سامی نەریمان بۆە، هـێزو، تووانایەکی خودا پێداوی، وای هەبۆوە کەس، دەروەستی نەهاتۆە، تەمەنێکی زووۆر درێژی بۆوە، خزمەتی بە شایانی کەیانی وەك کەی قوباد، کەی کـاووس‌و، کـەی خوسرەو، کردۆە، (دێـوی سـپی) کـە لە ئـەشکەوتیکیّ، مـازەندەران دا دابـۆە، کوشتۆەو، کەی کاووسی لە بەند، ڕەزگار کردۆە

(ڕەخش): ئەسپ و، چارەوێی بە ناوبانگیّ ڕۆستەمە کە، هـەمیشە دەگـەڵ ڕۆستەما بۆوە (ئەسفەندیار): یەکێك بۆە لە هەرە پاڵەوانەناودارەکانی سـەردەمی ڕۆستەم و، بە دەنێکی پۆلاینی هەبۆە، هیچ تیرێك کـاری لیّ نـەکـردۆە، بـەڵام، روستەم بە تیری ژاراوی گەزی دوهاچە، لە هەر دك چـاوی دەداو، دەی کـوژی، پاشان ڕۆستەمیش بە فێڵ‌و، تەڵەکەی (شوغاد)یان شوغاڵە کەچەڵی برای بە خۆیی و، بە ڕەخشەوە دەکەوێتە چاڵی پڕ لە سەرەتیری ژاراوێوە[1] بەڵام، روستەم بـەر لەوەی گیانی دەر چێ،تیرێکی داوێتی و، مەرگی شوخاڵ دەخاتە پـیش مـەرگی خۆیەوە دیارە زۆر کەس لایان وایە کە ڕۆستەم کورد بۆە و، خەڵکی زابان، واتە (زاب)یانی چۆمی کەڵوی لای (سەردەشت)، بەڵام چونکو لە شـێوەی نـوسینی خەطی ئاوێستادا لام (ل)، و نون (ن) زۆر وەك یەك دەچن هێندیك کەس لایان وابۆوە، خـەڵکی (زابـول) بـووە لە لایـەکـی تـریشەوە، نـاوچەی کوردستـان لە هاتوچۆی گەڕۆك و، توژێنەر، زۆر، دور بۆوە بەم هـۆیەوە نـەزانـدراوە، زاب لە

---

١ دیارە هەوەك لە کۆتایی چیڕوکە (داری پیرەدار) کەدا، سەبارەت، بە بیرو، ڕای برای تیکوشەرم، کاك ڕەشید خوسرەوی دەربارەی هۆنراوە کەو، میرزا شەفیع‌و، (تاقەداری، قافلانتو، دوام‌و، ڕام گەیاند، داری پیرەدار، لە ناوچەی دینەوەرو، ئاوایی عبدالمحمد،دا هەڵ کەوتۆوە، کا ڕەشید لای وایە، ئـەم چاڵەی بە،دهۆ، بۆروستەمیان هەڵ کەندبوو، شوێنەواری هەر لە لای ئەو تاقەدارەیەو، روستەم، بە تیری ژاراوی شوغاڵە کەچەڵی برای بەوەوە درو، وەو، لە گەڵ ئەوداره جوتی کردۆە، چون شوغال نە، زۆر سەرپەنجەی روستەم - ئامانەپای من نیشی کرد، وە چەشم [ نوشاد]

کۆیەو، کەوتۆتە کوێوەە هەروەك زۆرکەس سەبارەت بە (زەردوشت)، تۆشی ئـەم هەڵەیە، هاتونو، لایان وایە خەڵکی رۆژ هەڵاتی ئێرانی ئەوسەردەمە بۆە، کە چی رۆن بۆ تەوە خەڵکی رۆژئاوای ئێران، واتە کوردستانو، دەورو، بەری گۆمیلکەی (ورمێ) بۆوەە خەطی رۆیشتنو، دەر بە دەرێکەشی بـە نـاوچەی سـەردەشتو، کوردستان، کرماشانو، هەمەدان، دابۆەە بـەلاَم زمـێنی دیـنەکـەی کـەوتۆتە روژ هەلاَتو، لە ویۆە، پاشماوەی ئایینەکەی کەوتۆتە دەس گـەرۆك و لیٚ کـوٚلەرەوە دەرەوەیەکان «بۆو، مەبەستە پتر بڕواننە کتیبی، جوغرافیـای غـەرٚبی ئـیٚران یـان کوهھای ناشناختەی ئاوێستا، نوسراوەی دەوڵەت شاهی کرماشانی» (دارا): کورٚیٚ هوماو، باوکی فەیروز شابۆوە (کەشواد): یان گەشواد، واتە دەمەوە رو، زارپـاراو، کلاو، زێرێن، کوڕی بەش فرەو، لە تۆرەمەی کاوەی ئاسنگەر بـوٚوە، زنـجیرەی گۆدەرزەکان لەوەوە کەوتۆتەوەە دیارە گۆدەرز یەکیك بۆە لە هەرە پاڵەوانە بەراو، تەگبیرەکانی سەردەمی کاووسی کەیەکـە شـوادیش لە پـاڵەوانـە نـاودارەکـانی فەرەیدون و کوڕەکانی (ئێرەج و، سەلم و تور) بۆوە

(جەمشید): شید، روناكو ورشەدار، وە بە واتە(وەدا)، (جەم) واتە، کوڕی رۆژ، ئەم جەمشیدە یەکەمین کەسیك بۆوە تا ئەوسا کە، لە بەرەی ئادەمیزادا، کـە مەرگ بە سەری دا، زاڵ بۆوەو، مردۆە، دیارە ناوی یەکێك لە شایانی پێشدادیش بۆوە، بە واتەی (شـانامە) جـێژنی نـەوروز ئـەم جـەمشیدە دایهێنـاوە ، پـاشان (ضوحاك[1]) جەمشید لە سەرکار لادەباو، بۆ خۆی دەبێتە جێگری، دوایە (کاوەی) ئاسنگەر، کۆتایی بە گیان و، حوکومەتەکەی دێنی و، فەریدون دەکەنە شای ولاَت (کە هکەشان): یان کا، کێشان، خەطێکی سپیٚیە،کە، لە صەدان میلیون ئەستێرە پێك

---

١ وەك زوربەی نووسەرو، مێژو، زانەکانی کوردو، فارس و، لاوەیی، دەنوسن زوحـاك سـامی نـژاد بۆوەو، زوریشی حەظ، لەم دومارە کردۆوەوە وەك پـەرستن، پـەرستونی، هـەمیشە بـەلایەوە بـوون، دەچونە سەرشانی و، پایۆکەیان دەخواردەوەە لە خواردەمەنی خۆی بەشی ئەوانی دەدا، بە بیانوی ئەوە وەکە ئەم دومارە حەظ لە مێشك و، مژی بەرەی مرۆڤ، دەکەن، هەمورۆژێك، بۆکەم کردنەوەی لاوە ئاری نەژادەکانو، لە پەرەخستنی زەوو، زوی دایکەکان، دەی هێنا، دو، لاووگـەنجی ئـاری نـژادی دەکردە قوربانیو، سەری دەبڕینە جا ئەوە بوو زۆر، لە لاوەکان، لە چیاو ئەشکەوتەکان دا لە ترسی ئەم پەلامارە، بە ناو مارە ، خۆیان حاشار، دەدا، کە بە واتەی فیردەوسی، ئێمەی کورد، لەم لاوە جوامیرو، ئازایانە کەوتوینەوە.

هاتوّه، شەوانە، لە ئاسمانا، وەبەر چاو، دەکەون، وەك رێگایەکی کالێرژاو، دەکەوێتە بەر چاوان (هوشەنگ): کوڕی سیامەکی پێشدادی و، نەوەی کەیومەرث یەکەمین شای، زنجیرەی پیشدادییە، کاتێ سیامەك لە شەڕی دێواندا، کوژرا، لە لایەن کەیومەرثەوە، هوّشەنگ، بۆ سەر کوت کردنی ئەو دێوانە (خەڵکی ناوجەنگڵ و چیاو، لێرەوارەکانی ئەوساکە) دەنێردرێ، پاش شەڕێکی دورو، درێژ، دەیان شکێنێو، پاش ۴۰ساڵ شایەتی دەمرێ، هوّشەنگ، لە بەردی ئەستێ و چەخماخ (ئاگر،) وەدی دێنی و، جێژنی (سەدە)ش یادگاری ئەوەە دیارە ئەو جێژنە لە شەوی دەهەمی مانگی رێبەندان، دا، دەگیرا، ئاوردوێکی زۆریان کۆدەکردەوە، قەرەمەشخەڵیان لێ دروست دەکرد، بە دەوریدا، هەڵ دەپەرینو، شادی و، خۆشیان دەر دەبڕی ، ئەو جێژنە دوای تیپەڕبونی صەد، روژ لە جستان (واتە لە هەوەڵی مانگی نێوەراستی پایزەوە تا، دەهەمی نێوە مانگی جستان) دەگیرا:

(ئەطرود): یان ئەترود، ئەترور، بە نوّکەرو، کوّیلەی تایەبەتی شاووتراوە، ئەطروط، باوکی گورشاسبو، باپیرەی نەریمانی باوکی سام بوّە

(کاوەی حەدّاد): واتە ئاسنگەر، ناوی ئەوکەسەیە، کە، سەر پەرشتی چەكو، جو بە سازی سوپای لەدەس دابوّوە، زوّریش شاکانی زنجیرەی پیشدادی خوّش ویستووە، وەك شانامەش دەڵێ ۱۸ کوڕی بوّ دابین کردنی هوّلمانو نەوسی ماری سەرشانی ضوحاك لە دەس دەداو، پاشان شوّرش دەکاو، ضوحاك دەگرێ، وەك کتێبی «ناسخ التواریخ» لە بەرگی یەکەما، دەڵێ. کاتی ضوحاك لە گرتنی (فەریدون) ناهومید دەبێ، فەرمانێك دەردەکا بە موّرو، ئاژوّی هەموگەورەگەورەکانی بارەگای شایی، کە ضوحاك لە ماوەی دەسەڵاّت دارێتیدا، تائێستا، لە کاری چاکە بە دەر، هیچکارێکی نەکردوّە، کاوە لەوکاتەدا، کە دەیانەویست کوڕی نوّزدەهەمیشی بکەنە قوربانی بوّ مارەکانی سەرشانی ضوحاك، ئەو فەرمانە لە بە ر چاوی خەڵك، دەسوتێنێو، دەگەل نەیارەکانی ضوحاکدا، پەیمانو، بەڵێن دەبستن، لە بەرە بەیانی روّژی نەوروّزدا، لە سەر چەن جێگای بەرز، ئاگر هەل دەکەنو، کاوەش بە کەوڵی ئاسنگەرێوە، مەشخەڵ بە دەس دەکەوێتە پێشیانو، ضوحاك دەگرێ پاشان دەچەن

فەریدونی کوڕی ئابتینی پێشدادی کە، لە کێوی دەماوەندا خۆی حاشار، دابو، دێنن و، دەکەین بە شا، (کاوە) بە فەرمانی فەریدون ماوەی ٢٥ سال واتە تا: دەمرێ، عێراقی عەڕەب و، سوریەو، ئاذەربایجان و،کوردستانی، پێ دەدرێ ئەویش تەواوی ئەو ناوچانە لە دارو دەستەی ضوحاك پاك دەکاتەوەە پاشان حوکومەتی أصفەهانیش وەدەس دەخاو، پاش ماوەیەك دەمرێ (قوبادو، قارن): ئەم دوانە دو کوڕی کاوەی ئاسنگەر بون و، لە شوڕشەکەی باوکیاندا، دژی ضوحاك، نەخشێکی زوڕ گرینگیان هەبوە، دوای مردنی باوکیان، دەبنە، کار بە دەستانی هەرە نزیکی فەرەیدون، قارن دەبێتە سوپا سالارو، فەرماندەری گشتی سوپای فەرەیدون،و دەگەڵ ناودارە گەورەکانی وەك (سامی) نەریمان، (شێروێە) و ، (شاپور)و، (قوبادی) برای و، (گوشتاسب)و، خودی (مەنوچهر) دا، دەچی بوشەڕی (سەلم)و، (تور)و، بە سەر کەوتوێیەوە، دەگەڕێتەوە ئەوەش بڵێن، ئاوایەك لە ناوچەی (نەغەدە)دا بە ناوی (قارنێ) کە، کەوتە بەر هێرشی دارو، دەستەی مەعبودیو، خەلکەکەیو، تەنانەت ماموستای ئایینێ کەشی، رەشەکوژ کران، هەیە (مەنوچێهر) کوڕی ئێرەج شای پێشدادییە، دیارە، دومامۆی خوی واتە سەلمو، تور، بە توڵەی باوکی دەکوژێ، مەنوچیهر کە، سوپاسالاری وەك قارن، سام، زاڵو، روستەمی بوو، ٥٠ ساڵ حوکومەتی کرد، (نوذەر)ی کوڕی لەبەر، لێ نەهاتویی نەیتوانی دوای باوکی فەرمان ڕەوایەتی بکا، وەك ماموستا دیخودا، دەڵێ، کاتێ، سەلمو، تور، ئێرەجیان کوشت، قڕانیان دەژن و، منثداڵەکانیشی خست، بەلام. دایکی مەنوچیهر کە زگی بەو، پڕبو، ڕای کردو، لە کێوی مانوشاندا، خوی شاردەوە، تا ئەو کوڕەی بوو، چونکو لەو کێوەدا، هاتبوەدونیاوە، پیان وتوە مانوش چیهر. پاشان ووشەکە سواوەو، بوتە منوچیهر، واتە دیمەن بەهەشت: سەلم،طور- ئێرەج: فەرەیدون لە کچی ضوحاك دوکوڕی بوە بە ناوی سەلمو، تور، لە ئیراندوختی کچی شامەردیش ئێرەجێ بوە، بەر لە مردنی خوی، هەمو ولاتی لە نێوان کوڕەکانیدا، بەش کرد، ناوچەی بین النهرین و، عەربستانی، دا، بە سەلمی کوڕەگەورەی، ماوراءالنهرین و، مەغولستانیدا، بە تور، کە بە یارمەتی گرشاسب زوڕ جێگەی تریشی خستە سەر بەشەکەی خویو، تورکستان، تا تاریشی کردە ئی خوی.

تورو، سەلم نەخشەی پیلانی کوشتنی، ئێرەجیان کێشاو، سوپایان هێنا سەر، فەرەیدون فەرمانی بەربەرەکانی دا، بەلاّم، ئێرەج خوّاهیشتی لە باوکی کرد، بابەتەکە، بە هێدیو، هێمنایەتی کوّتایی پی بدریّو، دەگەلْ براکانی شەرْ نەکا. خوّی بوّ، وتووێژ چوّە لای براکانی ئەوانیش، گرتیانو، کوشتیان، ئەوە بوو. کاتیّ مەنوچیهر گەورە بو، باپیرەی، یارمەتی دا ئەویش مامەکانی بە توّلەی باوکی کوشت:

پەشەنگ: کوڕی شاپناسب – وە رشێب – تورك، توری کوڕی فەرەیدونە، دیارە ناوو، شوّرەتی پەشەنگ زیاتر، بە هوّی ئەفراسیابی کوڕێوەیەتی، «پوری پەشەنگ) پەشەنگ ناوی نەوەی توری کوڕی فەرەیدونی باوکی ئەفراسیابی توران زەمینە، ناوی برازای فەرەیدونی باوکی مەنوچیهرو، میردی ماه ئافریدی کچی فەرەیدونە:

شەهزاد: یان شاهزاد، چوك کراوەی، شاهزادە: شەهزادە، شەهزوود، شەهزور، یان شەهرەزورە، وەك ماموّستا دێخودا، دەلْیّ، ناوچەی شارەزوری کوردستانی عێراق لە باری ئایینێوە پێوەندێکی توندی دەگەلْ بیرو باوەڕی علیٌ اللّهیْ کاندا، هەیە، چونکو لایان وایە ڕوّژی مەوعود، واتە: حیسابو، کیتاب، ڕوّژی حەشر، لەم ناوچەیەدا، پیك دیّ زالْی پوری سام، پالّەوانێکی فیشالْی شانامەیە، زوّر، ملهوڕو، بە دەسەلاّت بوّە، بەراوشکاری دەچیتە ئەفغانستان، ئوگری ڕودابەی کچی سوهراب شای کابول دەبیّ، شەوێك لە دیواری کوّشك سەر دەکەوێو، ڕودابە هەلْ دەگرێو، دەیِ هێنیّ بوّ ئێران، ڕوّستەم لەم ژنە دەکەوێتەوە[1]:

(سامی نەریمان): کوری کوڕشاسب، کوڕیّ ئەطروط، طورەك، شێداسب، توّژی کوڕی جەمشیدە، سام، سوپاسالاّری مەنوچیهرو، دوای قارْنی کوڕی کاوەی ئاسنگەر، ئازاو، دلێرو، بوێرترین سەردارانی کاتی خوّی بوّوە، حوکومەتی ڕوّژهەلاّتی ئێران زابول، کابولو، هێندیك لە مە غولستان کە بە دەس گورشاسب، گیرابون، بە دەس سامەوە بوّوە، دیارە سام لە کچی میر بە لْخی بوّە: (هوّمان و، پیران): هوّمانو، پیرانی وەیسە دوپالەوانی ئەفراسیاب بون، هوّمان پالّەوانێکی بە فیلْ و،گەڕو، مێملّو، چلو، چوّکەر بوّوە، دەگەلْ (گریسێوز)ی برای ئەفراسیابدا، بوّ

---

١ دیارە ئە مەش هەر فیشالّەو، بە لْگەی برْوایی کراوی نییە.

کوشتنی (سیاوەش)، پیلانی نابۆوە، لە ئاکامدا هۆمان بە دەستی گیوی کوڕی گۆدەرز، دەکوژیرێ: (کاووس): کوڕی کیاخۆە، کوڕی کەی بوە. زۆر خاوەن زۆاڵەتو، بێ ئاوەزو، دەم دەمی بۆوە لە بەر زەلامی و، قورسیو، سەنگینی کەم، یەکسمو، چارەوێ توانیوێتی هەڵیگرێ، لە بەر ئەوە زیاتر لە صەد ساڵ شایەتی کردوەپیان گوتوە نمرودی زەمان (فەریبورز): کوڕی کەی کاووس و، برای سیاوەشە (بەهرام): ناوی شەش کەس لە شایانی ساسانی بوە، لە ساڵی ۲۷۳ زایەنیوە تا ۴۳۸ شایەتیان کردوە، کوڕی گۆدرز بە ناوی بەهرامی بەهرامان نێودێر بوە،

(بەهرامی گۆڕ) ناوی سەر لە شکری هۆرمزی کوڕی نۆشیروان بوە

(جاماسب): کوڕی لوهراسب و، شاگردی زەدوشت پێغەمبەر بوە، ناوی حەکیمو، زانایەکی ئێرانیش بوە کە. زۆرشتی، تێبینی کردوە جاماسب کچی زەردوشت بە ناوی (پوروەحیسەت) ئەخوازێ جاماسب دەگەڵ براکەی بە ناوی فەرشوشتەر، وەزیری گۆشتاسب بون

(بەهمەن): یان وە هومن واتە، خوو، خەصڵەت باش، بە هوی باشی و، ڕاستی و، دروستی بوتە لە قەبی ئەردەشێری کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی گوشتاسب، (ئەردەشێر) یان (هەردە، عەردە، ئەرضە) شێر. لە بەر ئەوەی دەستی زۆر درێژ بوەو، دەستەکانی دەگەیشتنە سەر چوکی پێ گوتراوە، دەست درێژ وە لە بەر، ئازایەتی و، دلێریش لەقەبی ئەردەشێر، واتە: (شێری عەرد)ی پێ دراوە (ساسان) واتە، ڕەبەنو، بێ سامانو، سواڵکەر. دیارە ساسانی کورد، یا شوان و، دەشتەوان، باپیرەی بنەماڵەی شایانی ساسانی و، باوکی پاپەکەی بابی ئەردەشیری یەکەمین شای ئەوزنجیرەیە بوە، دیارە مام پاپەك، یان پەتك واتە گوریس کە لە بەر درێژی وایان پێ گوتوە، لە ناوچەی شوانکارەی فارسدا، ڕابەری ئاینیو، و، فەرمان ڕەواش بوە، ناوی دایکی پاپەك، وەك زانای بەناو بانگ ماموستا (دێخودا) دەڵی و، لە نوسراوەی (کا بەی) زەردوشتا هاتوە، ناوی دینەگ، بوە، ناوی دایکی ساسانیش (رام بە هیشت) کچی گوزەهری (بازەنگی) میری ئیستەخری فارس بوە:[1]

---

١ پیویستە، قامك بۆ دوو خاڵی گرینگ، ڕادێرم، یەکەم، ئەوەکە، ماموستا کەماڵ ئەحمەد مەظهر، لە

(بەهرامی چوبین):ناوی سەر لەشکری هۆرمزی کوڕی نوشیرەوان بۆوە، لە بەر ئەوەی زۆر لە ڕو، لاوازو، ڕەق و، ویشك دەبێ، پێ دەڵێن، چوبین واتە دارە ڕەقە: (شێرۆ): کوڕی خوسرەو پەرویز بۆوە، شێرۆیە، کوڕی بێژەن و، نەوەی گیوە، شێرویەی کوڕی پەرویز لە مەریەمی کچی قـەیصەری ڕوم، کـاتێ زانـی بـاوکی دەیەوێ مەردانشای برای بکاتە جێگەری خۆی دەگەڵ سوپاسالاری باوکیا، واتە (گوشەنسب ئەسپاذ) کە برای شیری شێرویە دەبی، دەست دەدەنە دەس یەك و، باوکی لە سەر تەخت وەلادەباو، هەمو براکانی دەکوژێ و، خۆشی پاش شەش مانگ دەرمان داو، دەکریّ و، دەمرێ: (بوذەر جومیهر): بوزورگمیهر،نـاوی زانـای گەورەو، بەناو بانگی کوڕی بەختەگانە، کە سالانی سال، وەزیـری ئـەنوشێروان بۆوەو، لە نوسراوە مێژوییەکاندا، بە باشی ناوبراوە (بەختەك): ناوی باوکی بوذەر جومیهرە (هورمز): ناوی سەردارێکی ئێرانی بۆوە کە دەگەڵ خالیدی بنی وەلیدا، شەڕی کردو،کوژرا: هۆرمزی یەکەم کوڕی شاپوری ساسانی، دوهەم کوڕی نیرس ، سێهەم کوڕی یەزدی گوردی دوهەمی ساسانی، چوارەم،کوڕی ئەنوشیروانە، کە لە هەمویان نێو بە دەرەوە تر بۆ. پێنجەم نـەوەی خـوسرەو پـەرویزو، ئـاخرین پادشای ساسانی دوای (ئـاذەرمیدوخت): بـوە: (دوخت)، یـان دۆت واتـە کـچ، زورجار بـە شـوێن نـاوی تـایەبەتا، دێ، وەك ئـاذەرمیدوخت، پـوران دوخت، توراندوخت، سیمین دوخت هێندیك جاریش، بە تەنیایی دێ وەك ئەمڕۆ باوەو، لە کوردەواریشدا، دۆ، یان دۆت، ئەوترێ (ئەنوشێروان): واتـە خـاوەنی گیـانی هەمیشەیی، ناوی کوڕی قوبـادی کـوڕی فـەیرۆزە، دایکـی کـچی وەرزێـرێکی نـەیشابور بۆوە، پاش باوکی براکانی خۆی واتە (کەبۆس و،جـام)، وەلادەنـێو،

کتێبی «تاریخ ایران الحدیث»دا دەڵێ: «مامۆستا ڕەشید یاسەمی کرماشانیو، هیکەش. بێ بەڵگەو، تاپۆ، نووسیویانە، ساسانی کورد بوون» بەلام ڕونەکە، لە کوردی شوانکارەی پارس (فارس) بۆوە. دوهەم ئەوەیە وەك ئیستە خری لە کتێبی«مسالك الممالك»دا،دەڵێ کوردە شوانکارەکانی فارس، لە سەردەمی «ئومەوێ» کانی عەرەب دا، خاوەنی ٥٠٠ صەد هەزار، چادرو، ڕەشمال بوون و، هەمو ساڵێك پیتاکی خۆیان، دەنارد، بۆ، ئومەوێکان، ئەوەشم لە بیر نەچێ، گۆیا، لەم دووایيانەدا، کتێبێك دەربارەی شێخی (سەعدێ) وە دەر چۆو، ئەمانیان بە کوردی شوانکارە، داناوە، کە بە داخەوە هێشتا من چاوم پێ ڕون نەبۆتەوە.

دەبێتە شا لە زەمانی ئەودا، هێمنایەتی سەرانسەری وڵات دادەگرێ، لە نێو شایانی ساسانیدا، لە هەموان نێو بە دەرەوە تر بۆوە، (ئـەردەوان) یـان هـەردەوان واتـە دەشتەوان ناوی پێنج کەس لە شایانی ئەشکـانی و، نـەسلی، گۆشتـاسب بـۆوە: ئەردەوان کوڕی وێشتاسب، کوڕی ئەرشام، کوڕی هەخامەنیش و، برای داریوشی یەکەم و، مامۆی خەشایارشایەو، سەرکردەی کێشکچێـانی خەشـایارشا بـۆوە، شەوێك لێی وە ژوردەکەوێ خەشایارشا دەکوژی، (ئەردەوانی پێنجەم)

دواهەمین شای ئەشکانی یەکە بە دەست ئەردەشێری بابەکان لە سەرکاروە لانراو، حوکومەتی لە دەس سیندرا: (ماچین): کەشەن، شین ناوی وڵاتێکە لە باشوری چین و، رۆژ هەڵاتی هیندوستانا، لە هەڵبەستو، وێژەدا، بە ڕوالەت مەبەست لە چین تورکستانی رۆژهەلاتو، لە (ماچین)، چینی ڕاستی یـان، چـینی گـەورەیە: چـو ئاگاهی نامەد، بە ماچین و، چین:بە گۆیەندە بـەر خـوانـدم ئـافەرین: فیردوسی (سورخە): کوریکی ئەفراسیاب بۆوە، کە بە دەس فەرامەرز یە خسیر دەبێو، رۆستەم دەیکوژێ دوخت: دۆ، دۆت، دوختەر، واتە کیژ، کـچ، مـەبەست لەم، کـەنیشکە، طەلعەت کچی سام بەگی زەعفەرانلوی کوردی حاکمی خەپۆشانە (قوچان) نادر: نادر قولی ئەفشاری تورکە، کە لە ساڵەکانی ١٧٣٠-١٧٢٩ واتە ٨ ساڵ بەر لەوەی لە سالی ١٧٣٦دا تاجی شایەتی لە سەر خۆی نێە، تا ئەو جیگایە بوی کرا، سەبارەت بە کوردەکانی خۆراسان، کوشت و، برۆ، دەس درێـژی کـرد، پـاشان لە شـەوی بیستەمی مانگی تەموزی سالی ١٧٤٧ زایەنی، ١١٢٨ هەتـاویی، ١١٦٠ کـۆچی مانگیدا، کاتێ خۆی تەیار کردبو شالاوێکی تر، بەرێتە سەر کوردەکـان، خـۆی بەدەس ئەوان کوژراو، بۆ هەمیشە تۆماری ژیانی پێچرایەوە: سولطان: مـەبەست شاتوماسبی (طهماسب) صەفەوی کوڕی شاحوسینی أصفهانە، دیارە نـادرو، شاهەر کیان، هۆملکێو، بەربەرەکانیان بو، بو، ئەوەی طەلعەت بخوازنو، خۆیان بە خزمایەتی کوردەکان لە بەرامبەر ئەوی ترا، بە هیزکا هەڵبەت هـەروەك مـامۆستا نوشادیش پێش بینی کردۆ «اقبالْ ئەولاد شاصەفی کەنگەن» لەم، گێرەو، کێشەو، مشتو، مرۆدا، نادر سەردەکەوێ، جاوا، ئێمە لێرەدا، ئەم چیڕوکو، روداوەیەتان، بە کوردی و بە کورتی بۆ، دە خەنیەرۆ، هیوایە کەڵك لەویش وەرگرن

نادرشای ئەفشار نادر لە سالی ١١٠٠ هـ ق لە سەر دەمی شاسولطان حوسینی صەفەویدا لە ئاوایی کالپوشی سەر بە دەرەگەزی قوچان هاتۆتە دنیاوە، باوکی امام قولی[١] بەگی تورك، لە عێلی ئەفشار بۆ، دوای گەورە بون. کچی، بابا عەلی کورد، فەرمان ڕەوای ناوچە. دە خوازێ، بە هۆی لیّ هاتویی سوروشتی و، خودا، پێداو، هەمیشە لە بیری پێکەوە نانی هێزو، وەدەس هێنانی، دەسەلاتو، توانا، دا، بۆوە بۆ، ئەم مەبەستە دەکەوێتە ڕێك خستن و، یەکایەتی. دوعیلی بە هێزو، توانای کوردو، ئەفشارە، وە لاوو، جوامێرە ئازاو، نەترسو، بە هێزەکان، لە دەورو، بەری خۆی کۆ دەکاتەوەو، سوپایەکیان لیّ پێك دێنیّ

لەم ، کاتەدا، (ئەشرەفخانی ) ئەفغان لە اصفەهانو، (مەحمود)ی سیستانیش لە، خۆراساندا، فەرمان ڕەوایەتیان دەکرد، (شاتوماسبی) صەفەویش دوای ڕاکردن لە بەندیخانەی قەزوێن کە لە: لایەن ئەفغانەکانەوە خرابوّوە بەندەوە، چوّوە (ئوستراباد) گورکان، هێرکانی، لای (فەتحعەلی خان)ی قاجار، هەلبەت باکوری خۆراسانیش بە تەواوی لە دەس کوردەکانا، بو، یەکێك لە هەرە دوژمنە گەورەکانی نادرقولی لە باری، دەس درێژی و، بە دەسەلات دارێتیّوە. (جەعفەر) بەگی شادلوی سەرەك هۆزو، (شاوێردی خانی) شێخانلوی کورد، بون، لە سالی ١١٣٦-١١٣٧ هـ ق دا، یانی بەر لەوەی شاتۆماسب بێتە کوردستان (خەپۆشان) نادر بۆ ئەوەی ، تازادەیەکی تر، خۆی بە هیزکا، کچێکی، شوکر بەگی کوردی شێخانلوی خواست، بەلام، لە لایەکی، دێوە دیتی، شاتۆماسب، دەیەویّ دەگەل بە هێزو، توّاناو، ناودێرترینی کوردی ناوچە واتە (سام بەگی)، وەکیل و، سەر کردەی کوردانی خوراسانا، خۆی نزیك کاتەوەو، کچی لی بخوازیّ، پێش دەستی کردو، نەی هێشت لەم کارەدا، شا، دەستی خۆی ڕەپیش خا، ناردیّ خوازبێنی (طەلعەتی): کچی، بەلام، سام بەگ کە خۆی فەرمان ڕەوایەتی و، سەر کردایەتی تەواوی

---

١ امام قولی قوورقلو، لە عیلی ئەفشار بوو، شاعەباسی صەفەویی ئەم هووزەی بۆپێشگری ئۆزبەکەکان هێنا بۆوە کەبکان، امام قولی پیاوێکی بیّ نێوو، نیشانو، کەول درو، بو، نادرر قولی لە تەمەنی ١٧ سالیدا. دەگەل دا یکی بە دیل گیراە پاش چوارسال کە دایکی بە دیلی مرد، لە دەس ئوزبەکەکان رای کردو، هاتەوە خزمەت باباعەلی کوری فەرمان رەوای ئەبیوەرد، بە هۆی لیّ هاتوییەوە بە پلەی ایشك ئاغاسی (رەئیسی تەشریفاتی دەربار) گەیشتو، کچی خۆی لی مارە کرد (دهـخدا)

باكوری خۆراسانی له دەست دا، بوو، به كەمايەتی و، كەسری شـانی دە، زانـی، خزمايەتی دەگەڵ نادر قوڵی دا، بگرێ٠هێشتا ولاّم و، بەرسفی نادر به تـەواوی نەدرابۆوە، شاتۆماسبيش به هۆی دوزمانی و، شۆفاريی فەتحعەلی خانی قـاجار (نەجەفقولی ) بەگی، رابەری زۆربەی كوردی شادلوی دايە، بەر تێغی ناپياوانەی خۆی و، كوشتی، بەم كاره نارەوايە، كوردەكان بۆيان رۆن بۆوە، شاطۆماسب، زۆر خوێرێو، بێ دەسەلاّتو، گوێی له مستی خانی قاجارە، نادر، لەم هەل‌و، هەڵەيە، كەلكی وەر گرت‌و، ديسان ناردێوە، خوازيينی و، هێجبێ تا بە، هەر پـاڕانـەوەو، لالاّنەوەيەك بێ، بەڵێنی له سـام بـەگ بستـێنێ بريـاريشی دا، له هـەلی خـۆيدا، فەتحعەلی خانيش به سەزای خۆی بگەيەنێ جا . ئـەوە بـو، نـادر، چـەن پيـاو، ماقوڵێكی ، ناردە لای (حەمە حوسين بەگی) كوری سام بەگ بۆ ئەوەی ئەوانيش خۆيان بۆ تۆڵە ساندنەوە له شاطۆماسب‌و، خانی قاجار. ئامادەكەن، بەلاّم حوسين بەگ لەو لاّما، رای گەياند، جارێ بابزانين، شا، خەريكی چفێڵ‌و، تەڵەكەيەكە، له لايەكی كەشەوە، بۆ كوردەكانی وولام نارد، تا سوپای نادر، دێ خۆيان راگرن‌و، وەڕێ نەكەون، لەم لاشەوە، نادر، بە ڕا ئەسپاردەی شا، كە، بۆكۆمەگ‌و، يارمەتی له دژی كوردەكان، نارد بويەلای‌و،گوتی، پـيويستە، شـا، سەبـارەت بـە ڕەفتـارو، كردەوەی خۆی دەگەڵ ،كوردەكان‌دا، نه ختێك باشتر، بيربكاتەوەو، بزانێ چدەكا، پاش روژێ نادر خۆی چۆوە، لای شاطوماسب و، له كـردەوە نـاله بـارەكـەی پەشيمانی كردەوەو، به پێشنياری نادر، حوسين بەگ بو، به حاكمی خەبۆشان‌و، ناوو، نيشانی خانيشی پێدرا، دوای ئەم ئالۆ،گۆڕە رۆژی ٢٢ی مانگی موحەڕەمی سالی ١١٣٩ كوچی مانگی سوپای شاطوماسب، بەرەو، مەشهەد، كەوتە ڕێ، نادر قوڵی و خانی قاجاريش ، له بنەوە، خەريكی، پيلان‌و، نەخشەكێشانی له ناوبردنی يەكتر بون، ئەوە بو، دوای ئەوەی سوپا، له باغی (خۆاجە ڕەبيع) دا، مۆڵی خۆارد، شاطوماسب فەرمانی، له سەردانی (فەتحعەلی خانی قاجار)و، چەن كەسی تری دەر كرد، له سەر خواستی نادرقوڵی ، سەری فەتحعەلی خان، به دەس (مەهديخانی) قاجار، كە دوژمنی خوێنی فەتحعەلی خان بو، لە، لەش جيا كرايەوەو، بەم جۆرە تۆڵەی كوڕە كورد «نەجەفقولی بـەگ» له كـۆنه سـەرداری شـاسوڵتان حـوسينی

صەفەوی سنرایەوەو، بۆ، هەتا هە تایە فتیلەی ژینی، کوژایەوە٠دیارە خـوێنی بـە ناحەق رژاوو، باڵی بە بیٚسوچ و، تاوان سوتاوی پەپولە، ئەوەندە موڵەت بە، شەم نادا، شەو، بەرۆژکاتەوە.

ئاونییە، خوێنی شەهیدان،نەوتە،- هەڵ دەبیٚو، هەل،لەژیان، هـەڵکەوتە- «هەژار» پاش چەن روژ شەرٚ ، سوپای شاطوٚماسب، مەشەهەدی گرتو، مـەلیك (مەحمودی) سیستانیش، خوٚی بە دەستەوە داو، کوژرا،

(شاه صەفی): ناوی شەشەمین شای صەفەوییە دیارە، ناوی راسـتە قـانی سام میرزا بوٚوە، ئەویش کوڕی صەفی میرزایە، دوای مردنی شاە عەبـاس لە ١٧ ساڵیدا «جمادی‌الاولی ١٣٠٨ دەکریٚ بـە پـادشا لە سـاڵی ١٣٥٢ دا، لە کـاشان دەمری، (ئەولادی شاصەفی): وەك باسمان کرد، شاتوماسبی کوڕی شا حـوسینی صەفەوی بوٚوە، کە لە ساڵی ١١۴۴ دا، لە شایەتی وە لانراە پاشان لە نزیٚك شاری سەبزەواردا، دەکوژریٚ: بە خواستی خو داوەندی میری مەزن، رۆن کـردنەوەی جیگەو، ناوەکانی داری جەنگیان مەشهور بە داری پیرەدار، دانـراوی مـاموٚستا نوٚشادی دیـنەوەری لە روٚژی شـەموٚ، ١٧ی پـوشپەڕی سـاڵی ٢۶٠١ ک- ١٧ی ١٣۶٨ هەتاوی ٥ی ذیحجەی ١۴٠٩ی کوٚچی مانگی، لە شاری تاران، لە لایەن منەوە (مەلا عەزیز داشبەندی) موحەمّەدپور، بە کـەلك وەرگـرتن لەم کتیٚبـانەی خوٚارەوە، تەواو بوو، خوداوەند یارمەتی پترمان بدا، بوٚ خزمەتو، راڤەی زیاترو، باشتر لە پیٚناوی ئەدەب و، ویٚژەو، زمان خوٚماڵیو ئایینی پیروٚزی ئیسلامدا، ئامین، یارَبَّ العالمین.



دۆخت – دۆت ( کیژه کوردی قوچانی )



اولاد صفوی ( سلطان – توماب )



نادر ( قوڵی ئه فشار )



عەزیزم کورد سواریکە ، لە کاتی هە لمە ت و جە نگا
هەلـو ، شمقار ، دژە جوچک ، لە بن چە نگـــــــا

## ئەمەش زۆربەی سەرچاوەکانن


۱: فەرهەنگی دێ خودا دانراوی زانای بلیمەت،عەلی ئەکبەری دێخودا
۲: فەرهەنگی موعین، دانراوی دوکتەر موحەمّەی موعین
۳: فەرهەنگی عەمید،دانراوی حەسەنی عەمید
۴: فەرهەنگی (نٰاظِمُ‌آلأَطِّباء) دانراوی عەلی ئەکبەری نەفیسی
۵: فەرهەنگی ئاناندراج،دانراوی موحەمەد پادشاه موتەخەلیص بە شاد
۶: فەرهەنگی غیاث اللغات،دانراوی غیاث‌الدین دەشتەکی
۷: اعلام المنجد،دانراوی کۆڕی زانایانی بێروت
۸: شانامەی فیردەوسی، دانراوی ابوالقاسم فیردەوسی
۹: گۆڤاری میهری ساڵی ۱۳۱۳ هەتاوی
۱۰: ناسخُ التواریخ = محمد تقی کاشانی
۱۱: تاریخی گوزیده = حمدالله مستوفی قەزوێنی
۱۲: ئێرانی باستان = موشیرالسلطنه، پیرنیا
۱۳: معجم‌البلدان = یاقوتی حەمەوی
۱۴: جوغرافیای غەربی ئێران= اعتمادالدین دولتشاهی کرماشانی
۱۵: دینور و ناموران آن = محمد جمیل روژبیانی (خطی)
۱۶: مهاجرت ایرانیان = دکتر جنیدی نیشابوری
۱۷: مسٰالك الممالك = ابن خردادبهٔ استخری فارس
۱۸: الایران الحاضروالحدیث = دوکتور کەمال مەظهەر

# برخی از آثار و تألیفات مؤلف

******************************

۱. بررسی تاریخی جبر و اختیار از دیدگاه معتزله ، اشاعره ، ماتریدیه ، زیدیه و ... .
۲. ارزش خط و سیر تکاملی و تاریخی آن .
۳. پژوهشی دربارهٔ جزری ( بدیع‌الزمان اسماعیل بن رزاز جزری ) .
۴. قواعد النحو الطرف یا « نحو داشبندی » ، زیر چاپ دانشگاه پیام نور .
۵. ترجمه کتاب « مجموع الرسائل » شیخ محی‌الدین عربی .
۶. ترجمه کتاب « کنز اللّسن » سید احمد هاشمی .
۷. چیروکی شه‌مال و زریان .
۸. ریزمان و خالداناتی زمانی کوردیی .
۹. سه‌ره‌تای به‌دیهاتنی شیعر و موسیقا .
۱۰. شیخ صه‌فی ئالی‌که‌ند و ، وشه‌ی که‌ند و گوند .
۱۱. لیکولینه‌وه‌یه‌ک ده‌رباره‌ی کوکردنه‌وه‌ی قورئان .
۱۲. لیدوانیک سه‌باره‌ت به ته‌جویدی قورئانی پیروز .
۱۳. کونگره‌ی مه‌وله‌وی کورد ، یان گه‌وره پیاوانی کورد .
۱۴. بوکه بارانه ئاوی ده‌وی .
۱۵. قسمت « الحقیقة الشرعیة » از میرزای قمی
۱۶. تصحیح و ویراستاری کتاب « النحو التطبیقی » از دکتر دیباجی ، استاد دانشگاه تهران .
۱۷. مقدمه و ویراستاری کتاب « ابراهیم بت‌شکن » به کردی .

۱۸. ویراستاری و آکسان‌گذاری دیوان « مه‌م و زین » استاد هه‌ژار ، چاپ پاریس .
۱۹. ترجمه و اعراب‌گذاری مفردات و جملات مشکل و غامض کتاب «الحیل » جزری زیر چاپ وزرات صنایع سنگین .
۲۰ . ویراستاری و اعراب‌گذاری اشعار و جملات عربی کتاب « نقشی از مولانا خالد نقشبندی » ، خانم دکتر معتمدی کردستانی .
۲۱. مقدمه‌ای به نام « به‌یت و باو » بر کتاب مه‌می ئالان به زبان کردی .
۲۲. ویراستاری و آکسان‌گذاری دیوان « دیاری نوی » میرزا ابراهیم افخمی .
۲۳. ویراستاری و تصحیح و تنظیم و ترتیب دو کتاب از ۴ کتاب داستان ترجمه شده از فارسی به کردی و ... .

# بانگاواز

*********

بو هەمو خوشک و برایەکی ئازیز و هیژای کورد:

« نەشری موحەممەدپور » لە شاری تاران، ئامادەی چاپ کردنی هەر چەشنە کتیب و نامیلکە و دیوانی کوردیی و فارسی و ئارەبی‌یە. هەروەها پیت‌چنی گشت نوسراوەیەکش بە هەر دو شیوەی نوسینی کوردی، ئارەبی و فارسی وەئەستو دەگری.

دیارە دانانی دروشمی پیتە گەورەکانیش (ـٚ) هەر بە کامپیوتیر دادەندری.

تلفن: ۶۰۱۱۸۱۵

تیبینی:

۱. وینەکانی ئەمیر حوسنیخان ـ دوتی قوچانی ـ ئەولادی شا صەفی، وە نادر قولی، لە بەرگی ۱ و ۳ی کتیبی « حرکت تاریخی کرد به خراسانِ » برای بەریزم کاک تەوەکودی‌وە راگویزراون:

ئیستا دەعوای دوخت نادر سولتانەن خەلق جەجەورەش بیزار جە گیانەن
رەعیەت فەرار خەلق خولقەش تەنگەن ئیقبال ئەولاد شا صەفی لەنگەن

۲. « فەرهەنگوکەی گورانی و سورانی »، دەگەل چیروکی « شەمال و زریان » داکە ئامادەی چاپە، دی

